پەروەردەی نوێ دیـــدی نوێ





بەهاری ٢٠١١



گۆڤارێکی پەروەردەیی زانستی وەرزیە

ماموستای سەرکەوتوو

# نـەوەی نـوێ... ژیـاری نـوێ

# پەروەردەکار کێ یە ؟

# فەلـسـەفـەی پـــەروەردە

هۆکاری
پشت ئێشەکەت
چی یە؟





دەروازەیەک
بۆ
تەندروستی گەنجان

**سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان**



**ژمارە: (٢١٠)**
**رۆژ: ٢٨ / ٢ / ٢٠١٠**

---

**تۆماری یاسایی**

بەپێی بڕگەکانی (1، 2، 3، 4، 5، 6) لە ماددەی (3)ی یاسای رۆژنامەگەریی لەکوردستان ژمارە (35)ی ساڵی 2007 کە لە 2008/9/22 بڕیاری لەسەر درا، پاش ئەوەی کە دەرکەوت ~~رۆژنامە~~/ گۆڤاری ( ژیار ) کە خاوەن ئیمتیازی ( باخەوان مەجید کەریم ) و سەرنووسەرەکەی (رزگار عەبدوللا حەسەن)، مەرجە یاساییەکانی تێدا بەدیهاتووە، لە سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان بە ژمارە متمانەی ( ٢١٠ ) تۆمار کرا.

فەرهاد عەونی
نەقیبی رۆژنامەنووسانی کوردستان
هەولێر ٢٨ / ٢ / ٢٠١٠



# دەروازە

**بەپێنووسی خاوەن ئیمتیاز**

بێگومان پەروەردەو فێرکردن کارێکی گشتگیرەو هەوڵ و تێکۆشانی گشتگیرو هەمەلایەنی دەوێ، پێچەوانە لەگەڵ ئەو ڕوانینەی کە پێی وایە پەروەردەو فێرکردن تەنها کاری وەزارەتی پەروەردەی، یان دایکو باوك یان مزگەوت یاخود گەڕەك وشەقام و کۆمەڵگەیە ،بەڵکو کاری هەموویانە و هەرکەس بە پێی ئاست و تایبەت مەندی خۆی ئەرك و بە رپرسیاریتی بەردەکەوێ ، هەوڵ و تەقەلاکانی ئێمەش لە ئامادەیی و پەیمانگای ژیار هەر لەم ڕاستیەوە سەرچاوەی گرتووە ، پێمان وایە هەر یەکێکمان بەر پرسیارین لە بەرامبەر پێشڤەچوونی ڕەوشی پەروەردە لە مرۆدا و پێگەیاندنی نەوەیەکی هۆشیار و زانستخواز بۆ سبەینەی گەشی نەتەوەکەمان لەم سۆنگەوە دوا ی پێشکەش کردنی خزمەتێکی بەرچاو بە بواری زانست و پەروەردە لە پەیمانگای ژیار، بە کردنەوەی یەکەم ئامادەیی ئەهلی لە کوردستان بە هەوڵ و توانای کادیرانی پێشکەوتووی خۆماڵی و تەژی بەبیری نیشتمان پەروەری ..... هەنگاوێکی تر لە ئامانجە پەروەردەییەکانمان نزیك بوینەوە بۆ دروست کردنی تاکێکی زانستخوازو خزمەت گوزار ، ئێستاش دەمانەوێ بەدەرکردنی گۆڤارێکی قەشەنگ تایبەت بە پەروەردە ، مەڵۆیەکی تر بخەینە سەر خەرمانی خزمەتکردن بە کاروانی پیرۆزی پەروەردە ،لەم پێناوەدا گۆڤاری (ژیاری ) پەروەردەیی ئامادەیە بۆ هاریکاری لەگەڵ دەزگاو لایەنی پەیوەندیدار بە ئامانجی بلاوکردنەوەی هۆشیاری پەروەردەیی و دەست نیشان و چارەسەری گیروگرفتەکانی پەروەردە لە وولاتەکەمان ، بە پەروەردەکاران و مامۆستایانی خۆشەویست ڕادەگەیەنین کە ژیار ماڵی ئێوەیەو دەتوانن بە بابەت و توێژینەوەو ڕخنەو پێشنیارە پەروەردەییەکانتان لاپەڕە ڕەنگینەکانی ژیار زیاتر برازێننەوەو ئەرکی ئاینی و نیشتمانی هەریەکەمان بەرامبەر بە نیشتمان و گەلە زانستخوازەکەمان جێ بەجێ بکەین ،کەزۆر لەمێژە عەودالی کەشێکی لەبارو ئارامە تالە دووتوێی دا ڕەورەوەی زانست و پێشکەوتن شان بەشانی گەلانی پێشکەوتوو تاو بدات. بەڵکو لەسەر وەختی پێگەیاندنی نەوەیەکی ڕۆشنبیرو زانست دۆست ، لە داهێنان و پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆژیا ،پشکدار بێت و جێدەستی خۆی بنەخشێنێ.



دیـــدی نـــوێ     پـــەروەردەی نـــوێ






zhyar.magazine@yahoo.com






گۆڤارێکی پەروەردەیی زانستی وەرزییە



ژیار گۆڤارێکی پەروەردەیی و زانستی و وەرزیە, بایەخ بە بنیات نانەوەو دووبارە دروست کردنەوەی کەسایەتیەکی بەهێز بۆ نەوەی نوێ دەدات. نەوەیەکی دەست و دڵ پاك زمان پاك و زانا و دانا ، لە سەر بنەمای زانست و ڕەسەنایەتی و داهێنان.بۆ خزمەت کردن نیشتیمانەکەی.

پەروەردەکردنی نەوەی نوێ بە هاوسەنگی لە نێوان عەقل و ئیمان و جەستە ودەروون تا بە هاوسەنگ و تەبایی لەگەڵ واقیع هەڵبکات و توانای هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی لە دوا ڕۆژدا هەبێت.

هەوڵدەدات بۆ خستنە ڕووی گیرو گرفتەکانی پەروەردەیی لە ناو قوتابخانە, خێزان, کۆمەڵگا و دانانی چارەسەری زانستی و واقیعی ، ئاراستە کردنیان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست .

هەوڵدەدات بۆ گەڕانەوەی [متمانە] بە خۆ بوون و نەتوانەوە لە ژیاری گەلانی تر، شانازی کردن بە کەلتورو بەها ڕەسەنەکانی نەتەوەکەمان .

فراوان کردن و بەرز کردنەوەی ئاستی ڕۆشنەبیری نەوەی نوێ بە چەمکە سەردەمیەکانی جیهانی نوێ.

# نەوەی نوێ... ژیاری نوێ...

**م: باخەوان مجید**

ئەگەر بەوردی لەو تابلۆ قەشەنگ و ڕێکوپێکەی گەردونبڕوانین، کەدروستکراوی جۆراو جۆری لێ دەژیت، هەمووی فەراهەم کراوە بۆ خزمەتکردنی بەرێزترین دروستکراو کە (مرۆڤە).

بێگومان ژانی بوون ئێش و ئازاری زۆرە، بەڵام لە دایك بوون ئومێدێکی نوێ دەداتە مرۆڤ و زەحمەتیەکانی ژانی بونی لە یاد دەچێ، مرۆڤ سەنتەری هەموو ئەو گۆڕانکاریانەیە کە بە درێژایی مێژوی مرۆڤایەتی بە پۆزەتیف یان نێگەتیف لە ژیارە جۆراوجۆرەکان ڕوویان داوە. مرۆڤ هەوڵی داوە هەمیشە کە ئەم زەویە ئاوەدان بکاتەوەو بە ئاسودەیی و ئاوەدانی بژیت، بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو پێشکەوتنە لەبواری تەکنەلۆژیا بەتایبەتی لە سەدەی بیست و یەك نەیتوانیوە دڵ و دەرون و هەستی مرۆڤ و مرۆڤایەتی ئاسوودە بکات و هەست بە هێمنی و ئارامی بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەگەر مرۆڤی سەدەی بیست و یەك شیکردنەوەیەکی دەروونی بۆ بکەین، دەبینین توشی چەندین نەخۆشی دەرونی و ژیری و جەستەیی هاتوە، بەڵگەی ئەمەش ئاماری UN کەلەساڵی ٢٠٠٣کرا سەبارەت بە دیاردەی (خۆکوشتن-suicide) لە جیهان دا هەموو خەڵکی سەرسام کرد چونکە زۆرترین ژمارەی خۆکوشتن لە یەکێك لە خۆشترین وڵاتانی جیهان (فلندە)بوو کەهیچ جۆرە گیرو گرفتێکی ئابوری و ڕامیاری نییە! زانایانی دەروونناسی ئەو وڵاتەش دەستیان کرد بە خوێندنەوەو توێژینەوەیەکی زانستی بۆ ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیە گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی کە مرۆڤی دروست ئەو مرۆڤەیە کە هاوسەنگی و هەماهەنگی لەنێوان (عەقڵ - دڵ و دەرون- جەستە)دا دەکات. ئەو دیاردەیەی (فلندە) بەوە لێك درایەوە کە هاوڵاتی فللەندی تێرو تەسەلە، لەلایەنی ماددی و جەستەیی، بەڵام کەمو کوڕیەکی زۆری لە لایەنی (ڕوحی)یەوە هەیە. عەقڵ بیر دەکاتەوە (فیکر)دروست دەکات، دڵیش هەست و سۆز) دروست دەکات، جەستەش بە پراکتیك ئەوانە جێ بەجێ دەکات. هەرکاتێ زێدەڕۆیی لە هەر یەکێکیان بکرێت کارەسات و نەهامەتی و ستەمکاری بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی دروست دەکات. تێگەیشتنی بەهەڵەو کرچ و کاڵ، لە هەموو ئاین و بیردۆزە دەست کردەکانیش دەرەنجامی لارو لاسەنگی لێدەکەوێتەوە. بۆ نمونە وەك لادانە جۆراوجۆرەکانی گروپە ئایینیەکان، لە بیردۆزە دەستکردەکانی مرۆڤیش کە زیاتر لە (٦٠)ملیۆن مرۆڤیان کردە قوربانی میتۆدو بەرهەمە فیکریە کرچ و کاڵەکانیان لە هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم. هەست و نەستی (نەتەوەیی)ش کە زێدەڕۆیی تێدا کرا مرۆڤی هەڵنا ڕووەو هەڵدێری (ڕەگەزپەرستی) وەك نازیەکان و فاشیەکان و عەرەبەکان. جەستەش بەهەموو ئەندامەکانیەوە بەم شێوەیە تووشی جۆرەها نەخۆشی دەبێت، ئەگەر زێدەڕۆیی لەگەڵ بکرێت و بکرێتە ئامانجی یەکەم و لە ڕیزی پێشەوە بێت، چونکە ریز بەندی مرۆڤی تەندروست دەبێ بەم شێوەیە بێ (عەقڵ—دڵ — جەستە کەخۆی لە ئارەزوەکان دەنوێنێ) بەڵام کاتێك ریز بەندیەکە ئاوەژوو یان پێچەوانە دەبێتەوە مرۆڤ وەك ئاژەڵ مامەڵە دەکات، هەمیشە بەدوای ئارەزووبازی و خواردن و خواردنەوە دەکەوێت.

دوو لەمپەری گەورە لە بەردەم مرۆڤ دانراوە، کە هەرگیز نەهێڵن ببێتە ئەو مرۆڤەی سودی بۆ خۆی و خێزان و کۆمەڵگاو نیشتمانی هەبێت، ئەوانیش شویوهات بۆ عەقڵ و دڵ و شەهەوات بۆ جەستەکەی. ئەڵمانیاو یابان کە دوو وڵاتی سەربازی بوون پاش شکست خواردنیان لە جەنگی جیهانی دووەم، ڕاستەوخۆ دەستیان کرد بە دروست کردنی (وەزارەتی پەروەردە) ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان بەرهەمی ئەم وەزارەتە لە هەردوو وڵات دەبینین، بۆ پێشخستنی وڵات لە هەموو بوارەکانی ژیاندا. بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتی هەرهەنگاوێك بنێین پێویستە لە عەقڵی مرۆڤ دەست پێ بکەین، بەشێوەیەکی زانستیانە پەروەردەی بکەین، (هەڵسوکەوت ناونیشانی ئەندێشەیە) بەم شێوەیە نەوەی نوێ لەم مرۆڤانە پێك دێن دەرەنجامەکەشی ژیارێکی نوێ بۆ مرۆڤایەتی دروست دەکرێ، نەك لەناو بردنی مرۆڤایەتی بە تەکنەلۆژیای سەردەم! لە مێژودا مرۆڤی خاوەن عەقڵ و دڵێکی پڕ لە باوەڕو جەستەیەکی تەندروست، توانیان ژیاری هەمەجۆر و ڕەنگاو ڕەنگ بۆ مرۆڤایەتی دروست بکەن، لە بەرنامەی پەروەردگاریش هەر لە سەرەتاوە ئامادەباشی بۆ ئەم سێ بنەمایە کراوە، کاتێ یەکەم مامۆستا وانەی یەکەمی بە هەڵگرانی پەیامی نوێ ووت، کە ئەم ژیارە نوێیە دەبێ هاوسەنگی بپارێزێ لە نێوان (عەقڵ و دڵ و جەستە). ستونەکانی باوەڕ پشت بە عەقڵ دەبەستێ و ستونەکانی ئیسلام پشت بە جەستەو پاشان بەهەردولاش (دڵ و دەروون وڕۆح) ئاو دەدەن تاوەکو مرۆڤە نوێیەکە دەگاتە پلەی (ئەوپەڕی چاکەکردن —الاحسان)بەم شێوەیەش مرۆڤایەتی سەر لەنوێ لە دایك دەبێتەوە.

# فەلسەفەی پەروەردە

پرۆفیسۆری یاریدەدەر. د. ئازاد علی

## پێشەکی:



پەروەردە یەکێکە لەو چەمکانەی کە ڕۆژانە چەندەها جار ولە لایەنی جیاجیادا دەکەوێتە بەرگوێمان. بێجگە لە دایك وباوکان ومامۆستایان وکارمەندان لە بواری پەروەردەدا، بایەخی میدیاکانی کوردستان بە پەروەردە لەزیاد بووندایە. بەڵام زۆرجار ئەم چەمکە حەقی خۆی پێ نەدراوە. زۆربەی جار لە بازنەی فێرکردندا تەسك کراوەتەوە. هەندێجاری تریش چەمکەکە زیاتر تەسککراوەتەوە بۆتە پرۆسەی فێرکردنی فەرمی لە خوێندنگاکاندا. لە ئەنجامدا ئەم دیدە تەسکبینە کاریگەریەکەی لەسەر لایەنەکانی تری کۆمەڵ ڕەنگدەداتەوە بۆ نمونە بۆدجەیەکی کەم بۆ کەرتی پەروەردە دەستنیشان دەکرێت کە بگونجێت لەگەڵ ئەو بازنە تەسکەی کە تیایدا قەتیس کراوە.

دیارە کێشەکە لەو ئاستەدا ناوەستێت ونەوەستاوە. وێڕای تەسککردنەوەی بوار وبازنەی پەروەردە، ناوەڕۆکی پەروەردەش بە شێوەیەکی تەمومژاوی باسی لێ دەکرێت، ئەوا ئەگەر هەر باسی لێ بکرێت. ئەم تەمومژەی کە ئەو چەمکەی داپۆشیوە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئێمە شیکردنەوەیەکی قووڵمان بۆ پەروەردە نەکردووە. خۆمان لە قەرەی بنەما فەلسەفیەکانی نەداوە. وبە دووبارەکردنەوەی چەند وشەیەکی بریقەداری وەك دیموکراسی ومافی مرۆڤ ولکاندنی بە چەمکی پەروەردە پێدەچێت گشت کێشە فەلسەفیەکانی پەروەردەمان چارەسەرکردبێت. بە دەرکردنی چەند ڕێنماییەك سەبارەت بە قەدەغەکردنی لێدان، جیهانی پەروەردەمان پێشخستووە. بە پیادە کردنی ئەو پەیڕەوەی خوێندن کە لە هەندێك لە وڵاتە زۆرپێشکەوتووەکان، لە بواری فێرکردندا، دونیای پەروەردەمان لێ بۆتە شامی شەریف وتەنها ئەوە ماوە کە چاوەڕوانی بەروبوومە دڵخۆشکەرەکانی لە داهاتوویەکی نزیکدا بکەین. بەڵام لەگەڵ ئەو خۆپیشاندانانەی کە قوتابیان لەم ماوەی دواییدا کردوویانە، پێدەچێت ئەم بەروبوومە لە داهاتوویەکی نزیك نەیەتەدی، ئەوا ئەگەر گریمان کە دەکرێت بێتە دی.

سیستەمی پەروەردە لە بۆشاییەوە سەرهەڵنادات بەڵکو پێویستی بە بناغەیەکی هزری هەیە. بە قەدەر پتەوی ئەم بناغە هزرییە، سیستەمی پەروەردەش پتەو وتۆکمە دەبێت وپێچەوانەی ئەمەش ڕاستە. هەر هەوڵێکی چاکسازیش لە بواری پەروەردەدا ئەگەر ڕەچاوی ئەم بناغە هزریە نەکات، ئاکامەکەی باش نابێت بەڵکو دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی سیستەمێکی شێوێنراو ونەوەیەکی ئەکادیمی سەرلێشێواو.

لە هەرێمی کوردستاندا ئەوە چەند ساڵێکە دەستکاری سیستەمی پەروەردە دەکرێت. شایەنی باسە ئەم دەستکارییە، ئەگەر نیاز ومەبەستی باشیشی لە پشت بێت، پێناچێت ئامانجەکانی پێکابێت. لە ماوەی چوار پێنج ساڵی ڕابردوودا چەندەها بڕیاری جۆراوجۆر دەرچوون بە مەبەستی چاککردنی سیستەمی پەرەوەردە. هەندێك جار بڕیارێك بڕیاری پێشخۆی پوچەڵ دەکاتەوە و حاڵەتەکە دەگەڕێنێتەوە دۆخی پێشووی. سیستەمی ئەژمار کردنی نمرەی قوتابیان لە سێ ساڵی کۆتایی قۆناغی ئامادەیی نمونەیەکی زیندوو وزەقی ئەم شەڕەبڕیارەیە. لێرەدا مەبەستمان

ئەوە نییە کە بڵێین کامە بڕیار باشە، بەڵکو قسە لەسەر میکانیزمی خودی بڕیاردان دەکەین. واتە گرنگ نییە بڕیارەکە چییە، بەڵکۆ چۆن بڕیارەکە دراوە؟ ئایا هیچ حسێبێک بۆ فەلسەفەی پەروەردە کراوە؟ ئەم وتارە باسی گرنگی فەلسەفەی پەروەردە دەکات وهەوڵ دەدات



چەند هێڵێکی گشتی ئەم فەلسەفەیە لە کۆمەڵگەی کوردەواری دەستنشان بکات.

## فەلسەفەی پەروەردە:

سەبارەت بە پێناسەکردنی فەلسەفە، د. نبیل عبدالحمید عبدالجبار دەڵێت: «فەلسەفە هەوڵی پرسیارکردنە لە چییەتی (ماهیە) شتەکان وڕووداوەکان ودیاردەکان وچەمکەکان، چۆنیەتی سەرهەڵدانیان وزۆربەی جار فەیلەسوفەکان هەوڵ دەدەن وەڵامەکانیان لە شێوەی سیستەمێکی فەلسەفی دابڕێژن کە قسە لە بوونەوەر وگشت ئەو دیاردانە دەکات کە دەیگرێتەوە لە لایەنی کۆمەڵایەتی و مرۆڤ وچالاکییەکانی ولایەنەکانی ژیانیدا» (عبدالجبار، ٢٠٠٣: ١٣).

بە پێی ئەم پێناسەیە، پەروەردە کە یەکێکە لە گرنگترین وبەهاترین چالاکی مرۆییەکان، بابەتێکە دەکەوێتە ناخی وچەقی لێکۆڵینەوەی فەلسەفییەوە. ئەم ڕاستییەش هەر لە کۆنەوە دەرکی پێ کراوە. ئەوەتا ئەفلاتۆن لە کۆمارەکەی ئاماژە بە چەندەها گفتوگۆ دەکات لە نێوان سوکراتی مامۆستای وهاوڕێیانی سەبارەت بە پەروەردە، بۆ نمونە قسە لەسەر پەروەردە کردنی دەسەڵاتداران دەکەن لە ڕێگای چیرۆك ومۆسیقا وحەماسەتدا وباس لە سێ هێزی سەرەکی لە مرۆڤدا دەکەن کە بریتین لە هێزی عەقلی وهێزی ئارەزوو وهێزی توڕەیی (أفلاطون، ١٩٨٠: ١٣٩). دکتۆر فاروق رفیق، سەبارەت بە پەیوەندی نێوان فەلسەفە وپەروەردەی لیبراڵ دەڵێت: «بە دەگمەن فەیلەسوفێك یان قوتابخانەیەکی فەلسەفی بوونی هەبووە کە دید وبۆچوونی نەبووبێت لەسەر پەروەردە ورۆڵی پەروەردە لە گەشەی رۆحی وعەقلی مرۆڤەکان...» (رفیق، ٢٠٠٦: ١١).

بەڵام فەلسەفەی پەروەردە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ ئایا دەکرێت فەلسەفەیەکی ئامادەکراوی کۆمەڵگایەکی تر بێنین، وەك چۆن کاڵاو شت و مەك لە دەرەوە هاوردە دەکەین، و سیستەمی پەروەردەمان لەسەری دابمەزرێنین؟ با بە پرسیاری دووەم دەست پێ بکەین چونکە لەوانەیە ئەم پرسیارە خۆی وەك وەڵامێك بۆ پرسیاری یەکەم کانید بکات. لەم ڕووەوە بە شیاوی دەزانم ئاماژە بە وتەیەکی کۆنانت بکەم، کە پەروەردەناسێکی ئەمەریکییە، دەڵێت: «پەروەردە پرۆسەیەکی کڕین وفرۆشتن نییە. کاڵایەك نییە بنێردرێتە دەرەوە یان بهێنرێتە ناوەوە. ئێمە لە چەند قۆناغێکی مێژوویماندا زیاتر زیانمان پێگەیشت نەك قازانج کاتێك بیرۆدزی فێرکردنی ئینگلیزی وئەوروپیمان هێنا بۆ ئەمەریکای وڵاتمان» (أبوصالح، ١٩٩٤: ٧٨٣). ئینجا ئەگەر هێنانی بیردۆزی فێرکردنی ئینگلیزی بۆ ئەمەریکا، کە خاڵی هاوبەشیان گەلێك زۆرە، بە هەڵە لە قەڵەم بدرێت، چۆن هێنانی نەك تەنها یەك بیردۆز لە بواری فێرکردن بەڵکو گشت سیستەمی پەروەردە لە وڵاتانی ئەوروپا بۆ کۆمەڵگای ئێمە کە خاڵی هاوبەشمان لەگەڵیاندا ئەوەندە کەمە کە بەراورد ناکرێت بە خاڵی جیاوازی، کارێکی ڕاست ودروست بێت؟ بۆیە بە دڵنیاییەوە دەڵێین کە هاوردە کردنی سیستەمی پەروەردەی هەر وڵاتێك بۆ وڵاتەکەمان کارێکی زانستی نییە وئەنجامی خراپی دەبێت لەسەر سیستەمی پەروەردە ولەسەر گشت توێژەکانی خەڵك.

**پەروەردە پرۆسەیەکی کڕین و فرۆشتن نییە. کاڵایەك نییە بنێردرێتە دەرەوە یان بهێنرێتە ناوەوە**

کەواتە فەلسەفەی پەروەردە دەبێت خۆماڵی بێت وهەڵقوڵاوی ئەو کۆمەڵگایە بێت کە تیایدا سەرهەڵدەدات. ئەوەش مانای ئەوە نییە کە پێویستە دابڕانی تەواو لە نێوان سیستەمەکانی پەروەردەی جیهان بێتەدی بە تایبەتی لە جیهانی ئەمڕۆدا کە بە هۆی هۆیەکانی گەیاندن بۆتە گوندێکی بچووك. بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە یەکێك لە ئەرکەکانی سیستەمی پەروەردە ئەوەیە کە تایبەتمەندی ئەو کۆمەڵگایە بپارێزێت

ونابێت لە ژێر هەر پاساوێکدا بێت سیمای خۆی لەدەست بدات وببێتە پاشکۆیەکی نەزۆك.

پێش ئەوەی چەند هەنگاوێکی تر بڕۆین پێویستە خاڵێك روون بکەمەوە. ئەوەی لەسەروە گوتمان مانای ئەوە نییە کە سیستەمی پەروەردە نەگۆڕ وگۆشەگیرە. دەکرێ بڵێین فەلسەفەی پەروەردە چوارچێوەیەکی هزری جێگیرمان پێ دەبەخشێت بەڵام گشت لایەنەکانی تری پەروەردە پێویستە بە پێی بارو زروفی کۆمەڵگا بگۆڕێن ئەگەر نا کۆن دەبن وبەکەڵکی بەکارهێنان نامێنن ودەبنە مایەی زیان بۆ کۆمەڵگا، وەك دەرمانی بەسەرچوو.

بێجگە لە خاسیەتی گۆڕان، سیستەمی پەروەردە پێویستە گۆشەگیر وداخراو نەبێت. بە پێچەوانەوە، پێوستە کراوە وئامادە بێت بۆ وەرگرتنی شتە بەسوودەکان جا لە هەر سیستەمێکی تری پەروەردە بیەوە بێت بە مەرجێك دژی فەلسەفەی پەروەردە نەبێت ئەگەر نا دووفاقی لە سیستەمەکە دروست دەبێت ولە کۆتاییدا تووشی ئیفلیج بوونی دەکات.

باشە ئەگەر نەکرێت سیستەمێکی پەرودردەی ئامادەکراو لە دەرەوە بێنین، چی بکەین؟ خۆ ئەوەتە سیستەمی پەروەردەی خۆمان دواکەوتووە هەموو لایەك گلەیی لێی هەیە وناکرێت بە پاساوی خۆماڵی بوون وەکو خۆی بەجێی بێڵین هەوڵی چارەسەرکردنی نەدەین. باشترین رێگا چارەئەوەیە کە چاو لە سیستەمی پەروەردەیی وڵاتە پێشکەوتووەکان بکەین کە گومان لەوەدا نییە وڵاتانی ئەوروپی لە پێشەنگی وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهانن لە زۆر لایەن کە پەروەردە یەکێکە لەو لایەنانە.

وەڵامی ئەو پرسیارانە بە یەکەم هەنگاو دەست پێ دەکات کە ئەویش پێداچوونەوەیە بە فەلسەفەی پەروەردە. خودی بیرۆکەی پێداچوونەوە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو فەلسەفەیە یان سیما وخاسیەتەکانی روون وئاشکرا نین، بە مانایەکی تر لەوانەیە ئەو فەلسەفەیە بوونی نەبێت، ویاخود سیما وخاسیەتەکانی ئاشکران، واتە فەلسەفەکە هەیە بەڵام نەگونجاو ونەشیاوە ونادروستە.

لەسەرەتادا پێویستە دان بەو راستیە بنێین کە پرۆسەی پێداچوونە بە فەلسەفەی پەروەردە لە هەر کۆمەڵگا وولاتێکدا کارێکی ئاسان نییە. ئەم پرۆسەیە پێویستی بە هەماهەنگی چەندەها لایەن هەن کە بەشدارن لە پەروەردە. بۆیە ئەو بەشەی ئەم وتارە وبەشەکانی داهاتوو تەنها هەوڵێکی تاکە کەسین وبە هیچ شێوەیەك لافی تەواوی وکامل بوون لێ نادات. بەڵکو چەند خاڵێك پێشنیار دەکات وچەند پرسیارێك دەوروژێنێت بۆ ئەوەی پەروەردەناسان گفتوگۆی لەسەر بکەن وهەڵیسەنگێنن. کراوەیی بەرەو بیروبۆچوونی جیاواز سیمای پەروەردەناسی راستەقینەی خەمخۆرە بەڵام داخراوی وتاکڕەوی وتەنیا خۆ بەڕاست زانی لەمپەرە لە رێگای گفتوگۆیەکی پەروەردەیی زانستی بەرهەمهێن.

**سەرچاوەکان:**


أبو صالح، محب الدين أحمد (١٩٩٤). تصور مقترح حول منهج البحث. من: المنهجية الاسلامية والعلوم السلوكية والتربوية: بحوث ومناقشات المؤتمر العالمي الرابع للفكر الاسلامي، ط٢. هيرندن: المعهد العالمي للفكر الاسلامي.

أفلاطون، (١٩٨٠). جمهورية أفلاطون، ترجمة: حنا خباز. بيروت: دار القلم.

عبدالجبار، نبيل عبدالحميد (٢٠٠٣). الفلسفة لمن يريد. اربيل.

عبدالجبار، نبيل عبدالحميد (٢٠٠٣). الفلسفه لمن يريد. اربيل.

رفيق، فاروق (٢٠٠٦). ئاشتکردنەوەی عەقڵ وعیشق: پەروەردەی لیبرال وئاکاری مەدەنی. سلێمانی: خانەی حیکمەت


# ژیانی دونیا

لەسەر خۆ پێ بنێ بەئەرزا چاوەکەم
چاوی چاوکاڵێکە لە ژێر پات
هەموو میوانە لەم ژیانە وەك
ئەم چاوکاڵە دێت و دەڕوات

ڕۆژێك دێت تۆش دەبی بە تۆزی
ئاخ و با هەڵت دەگرێت و دەتبات
دەبی بەتۆزی پێڵاوو یاخود
خەڵکی خانوت پێ سواق دەدات

نەرم و نیانی و خووڕەوشتی چاك
بنوێنە ئەمانەن بەڕاستی میرات
خزمەتکاریەو ئەمەك دار بە ،
ئەمانەن گەورەیی تۆ دەردەخات

مرۆڤانە بژی لەدوای خۆت ئەسەر
بەجێ بهێڵە بۆ نەوەی داهات
جیاوازی مرۆڤ و ئاژەڵ بەوەیە کەوا
مرۆڤ حیسابی دوای خۆی دەکات


د.سلیم سعید زەنگەنە
سوێد شاری بودن— ئەیلول—٢٠٠٨



# ڕۆڵی نوێکردنەوەی ئاینیی لە نوێکردنەوەی پەروەردەدا



عەبدولرەحمان سدیق

پرۆسەی پەروەردە، پرۆسەیەکی درێژخایەن و بەردەوامەو پێویستیی بەردەوامیشی بەنوێکردنەوە هەیە.

لەبەرئەوەی ئایینیش بەردی بناغەی پەروەردەیە لەهەر وڵاتێکداو، ئاینی ئیسلامیش وەك ئایینی ئێمەی موسڵمان، ئاینێکە لەهەندێك نەگۆر وزۆرێك لەگۆراوەکان بەپێی کەسەکان و زەمان و شوێنەکان، بۆیە خوای گەورە لەهەر سەدەیەکدا لەسەر دەستی کەسێك یان کەسانێك رەهەندە گۆڕاوەکانی ئایینەکەی نوێ دەکاتەوە، بەمەش زۆربەی بوارەکانی ژیان نوێ دەکرێنەوە، بۆیە نوێکردنەوەی پرۆسەی پەروەردە، پێویستیی بەنوێکردنەوەی ئایینی هەیە.

بەڵام زۆرجارمرۆڤ ئەم پرسیارە گرنگ وپڕ بایەخە لەخۆی دەکات: کە خودی ئایین بۆ گشت زەمان و شوێنەکان بێت و، لەلایەن خوای گەورەوە هاتبێت، ئایا کۆن دەبێت هەتا پێویست بەنوێبونەوە بکات؟! یان ئەوە تێگەیشتنی ئێمەیە بۆ ئایین کۆن بووە یان هەر لە کۆنەوە و بەکۆنی وەرمان گرتووە و، پێویستی بە نوێ کردنەوە هەیە؟!

گرفتی هەرە گەورەی ئێمە ئەوەیە کە قسە کۆنەکانی نوێکارێك بە نوێ دەزانین کە بۆ سەردەمی خۆی نوێ بووە نەك بۆ ئێستا، ئێمە ئەمڕۆ قسەی ئەمڕۆمان بۆ ئەمڕۆ پێویستە، نەك قسەی دوێنێ بۆ ئەمڕۆ، نەك قسەی ئەمڕۆش بۆ نەوەی ئایندە.

دەقەکانی قورئان و فەرموودە لەوێدا گەورەن کە لەگەڵ گۆڕانی سێ کوچکەی: مرۆڤ، کات، شوێن، مانای گۆڕاو و جیاواز دەدەن بە دەستەوە.

نوێکردنەوە لە راستیدا نوێبوونەوە نیە، چونکە نوێبوونەوە وەك لە سروشتدا دەیبینین دەستی ئێمەو کاری ئێمەی پێویست نییە، بەڵام نوێکردنەوە نوێکارێك یان زیاتری پێویستە و، پرۆسەیەکی مرۆییەو هزرو بیرکردنەوەی نوێی دەوێت.

نوێکردنەوە ئەگەر لە شکڵدا بێت یان ناوەڕۆك، لە دووبارە دانانەوەی بڕگەکانی تێگەیشتن بێت یان لادانی هەندێك شت یان خستنە سەر بێت،یان هەموو ئەمانە پێکەوە، گرنگ تیایدا ئەوەیە کەتەنها دروشم نەبن بەڵکو توانای گۆڕان بۆ پرۆژەیان تێدابێت

نوێکردنەوەی تێگەیشتن لە دەقە ئایینیەکان پرۆسەیەکی بەردەوامە و، نابێت بووەستێت، چونکە هەر نوێیەك هەتا کەی نوێیە؟ کێ بڕیاردەدات هەتا کەی نوێیە؟ ئەگەر نوێیە ئایا ڕاستیشە؟ چونکە هەندێك شت نوێن بەڵام ڕاست نین، هەندێك ڕاستیش کۆنن.

لێرەدا گرنگە، نوێ، هەر نوێیەك تا ئەو ڕادەیە پیرۆز نەکرێت کە هەتا هەتایە بە نوێ بزانرێت و دەستی لێ نەدرێت.

هەروەها نوێکاریش هەر کەسێك بێت

مادام مرۆڤە، پیرۆز ناکرێت وەك پیرۆزی دەقە نەگۆڕەکان.

لێرەشدا گرنگە ئەوە بزانین کە نوێکردنەوە کاری تەنها کەسێك یان گروپێك یان قوتابخانەیەکی دیاریکراو نیە، هەروەها لە تەنها شوێنێکدا و لە تەنها زەمانێکدا ناکرێت.

لە رووی سایکۆلۆژیەوە مرۆڤ لە کاتی بەهێزیدا گۆڕان ئەنجام دەدات و، لە گۆڕان ناترسێت و، لە سەردەمی ئاشتی و بە هێزیدا دەرگاو پەنجەرەی ماڵەکەشی دەکاتەوە، کە چی ئەوە سەردەمی شەڕ و شۆڕ ترسنۆکی و لاواز بوونی مرۆڤە کە دەرگاو پەنجەرەکانی دادەخات و نایەوێت گۆڕان ئەنجام بدات.

لەلای ئەو کەسانەی کە هەست بە هێزی خودی ئیسلام دەکەن و لایان وایە ئیسلام هێزی خۆی وا لە هێزی دەقەکانیدا، نوێکردنەوە ئاسانترە هەتا لای ئەوانەی هەمیشە وا دەزانن ئیسلام لە لاوازیدایە و لەبەردەم هەڕەشەدایە.

لێرەوە ئێمە دوو گرفتی دی بە دی دەکەین لە بواری نوێکردنەوەدا یەکەمیان لە خودی مرۆڤدا کەپێویستە بە ئەرکی نوێکردنەوە هەستێت و، پێداویستیەکانی نوێکردنەوە ئامادە بکات چونکە لە ڕاستیدا نوێکردنەوە لە هەر شتێکدا، نوێکردنەوەی خودی مرۆڤی پێویستە، چونکە ناکرێت مرۆڤی کۆنخواز ئەرکی نوێکردنەوە لە ئەستۆ بگرێت.

لێرەوە ئێمە ئەوەندەی باس لەنوێکردنەوەی ئایین دەکەین یان تێگەیشتن لەئایین دەکەین، یان لە سیاسەت یان لە ئابووری ئەوەندە بیر لە نوێکردنەوەی مرۆڤ ناکەین چونکە لە ڕاستیدا گرنگە بپرسین کامیان لەپێش ئەوی دی دایە: نوێکردنەوەی شتەکان یان نوێکردنەوەی مرۆڤ؟

**گرفتی هەرە گەورەی ئێمە ئەوەیە کە قسە کۆنەکانی نوێکارێك بە نوێ دەزانین کە بۆ سەردەمی خۆی نوێ بووە نەك بۆ ئێستا، ئێمە ئەمڕۆ قسەی ئەمڕۆمان بۆ ئەمڕۆ پێویستە**

گرفتی یەکەم ئەوەیە کە مرۆڤی لە کۆن گەیشتوو، نایەوێت تێگەیشتنەکانی نوێ بکاتەوە بە بیانووی ئەوەی تێگەیشتن لە ئایین یەکسان بە خودی ئایینەکە خۆی، کە ئەمەش وا نیە.

نوێکردنەوەی ئایینی بە مرۆڤی کۆن خواز وەك دروستکردنی خانووی نوێیە بە خشتی کۆن، کە دەتوانیت لە روو کەشدا بە ماددەی نوێ دایپۆشیت بەڵام لە ژوورەوەو لە ناواخندا هەر کۆنە.

گرفتی دووەمیش ئاراستەی نوێکردنەوەیە، بەمانای ئەوەی ئایا ئێمە بە ئاراستەی ئاسۆیی بەرەو پێش نوێکردنەوە ئەنجام دەدەین یان بەرەو دوا؟

بە ئاڕاستەی ستوونی بەرەو ژوور یان بەرەو خوار؟

یان بە شێوازی بازنەیی و خولانەوەی بەردەوام؟

زانینی ئەم ئاڕاستانە زۆر گرنگن بۆ ئێمە کە لە ڕاستیدا مرۆڤە ئایینپەروەرەکان بەسەر ئەم ئاراستانەدا دابەش بوون و کار دەکەن دەشێت نوێکردنەوە بە ئاراستەی ئاسۆیی بەرەو پێش بێت وەك ئەوەی



ڕوناکبیرە ئایینیەکان دەیکەن لە بواری ژیانسازییدا و ژیان خۆشکردندا.

دەشێت ناوی نوێکردنەوە بێت و بە ئاراستەی گەڕانەوە بێت بۆ سەردەم پێشووەکان و، خەڵکانی ئێستا حەز بکەن بچنەوە رابردوو.

دەشێت بە ئاڕاستەی بازنەیی بێت و، هیچ پێشکەوتن و پاشکەوتنی تێدا نەبێت بەڵکو خولانەوەی بەردەوام بێت بە جۆرێك کە نازانرێت ئاڕاستەی جووڵە بۆ پێشەوەیە یان بۆ دواوە.

ئاراستەی زۆرێك لە ئاینخوازانیش لە زۆربەی کات و لە زۆربەی شوێنەکاندا لەم جۆرەی دواییانەو، بەردەوام لە خولانەوە دایە و، بەسەر شتەکانی خۆیدا دێت و دەچێت و دەیانهاڕێت و ئەوەی ئەمرۆ پێی وایە قسەی لەسەر کردو چارەسەری کرد، ماوەیەکی دیکەش دێتەوە سەر هەمان باس وەك ئەوەی هەر باس نەکرابێت بۆیە بەردەوام قەیرانەکانی سەر هەڵدەدەنەوە و چەندبارە دەبنەوە، کە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە چارەسەرەپێشووەکان ڕووکەش بوونە و مەنهەجی نەبوون.

لێرەوە گەڕانەوە بۆ تێگەیشتن لە خودی نوێکردنەوە و، سروشتی نوێکارو، ئاراستەکانی نوێکردنەوە، یارمەتیدەرێکی گرنگن بۆ نوێکردنەوەیەك کە وەڵامی پرسیارەکانی ئەمڕۆ بداتەوە، بۆ نەوەکانی ئەمرۆ بێت و، پەروەردەی نەوەکانی ئەمرۆ بکات، هەروەك ئیمامی عەلی- خوای لێ رازیی بێت- فەرمووی: (مناڵەکانتان بەشێوازێك پەروەردە بکەن جیاواز لەوەی خۆتانی پێ پەروەردە کران، چونکە ئەوان بۆ زەمانێك هاتوونەتە دنیاوە جیاوازە لەو زەمانەی کە ئێوە بۆی هاتنە دنیاوە).

# مێشکی مرۆڤ: دیدێکی نوێ بۆ ڕەنگدانەوە پەروەردەییەکان

**پرۆفیسۆر: د. نبیل عادل فخری**

**بەشی کیمیا/ کۆلێژی پەروەردەی بەشە زانستیەکان**

ئەو توێژینەوانەی لەسەر مێشکی مرۆڤ ئەنجام دراون پاڵنەر بە هۆکارێکی سەرەکی بۆ فێربوونی قوتابیان و بە فاکتەرێکی چالاك لە دیاری کردنی گرنگی دانیان بە خوێندن دادەنێن. ئەم توێژینەوانەش ئەم ئەنجامانەی خوارەوەیان سەلماندووە:

هەر کە منداڵ درك بە دەورو بەری خۆی دەکات مێشکەکەی هەڵدەستێت بە دروست کردنی ژمارەیەکی زیاتری تۆڕە دەمارەکانی و ئەمەش ڕاستەوانە لەگەڵ دەوڵەمەندی دەوروبەرەکەی دەگونجێت، واتە دەوروبەرەکەی چەند هاندەر بێت لە فێرکردنی دەستەواژەو ناساندنی منداڵ بەو دەوروبەرەی، ئەوا ئەو تۆڕە دەمارانە زیاترو زووتر دروست دەبن. لێرەدا مێشك هەڵدەستێت بە جیاکردنەوەی ئەو تۆڕە دەمارانەی بەردەوام سوودیان لێ دەبینێت و دەیان چەسپێنێت و بەردەوامیان دەکات، ئەوانەی تریش کە سوودیان لێ نابینێت دەیان سڕێتەوە، وەك کردنەوەو داخستنی پەنجەرەکان. ئەو کردارەش لە ماوەی ژیان بەردەوام دەبێت و لە تەمەنی (٢-١١)ساڵی دەگاتە ئەوپەڕی. بۆ نمونە: سەرەتای کۆنترۆڵکردنی سۆزی منداڵ لە تەمەنی (٢-٣) مانگی دەست پێدەکات، واتە پەنجەرەکانی لەو تەمەنە دەکرێنەوەو دوای ئەوە دەتوانێت فێری کۆنترۆڵکردنی سۆزی ببێت. بەمەش ئەو شتانەی لە ماوەی کردنەوەی پەنجەرەکان فێری بووە زۆر زەحمەتە بگۆڕدرێن دوای داخستنی پەنجەرەکان.

بۆ نمونە پەنجەرەی فێربوونی زمانی دووەم لە تەمەنی (١٠-١١) ساڵی دادەخرێت، پەنجەرەی جووڵە لە دوای لە دایك بوونەوە تا تەمەنی دوو ساڵی دەست پێدەکات، هی لایەنی سۆزو کۆمەڵایەتی لە دوای لە دایك بوونەوە تا تەمەنی دوو ساڵی بەردەوام دەبێت، پەنجەرەی فێربوونی دەستەواژەکان



لە تەمەنی دوو ساڵی دەست پێدەکات و لە شەش ساڵیش دادەخرێت، پەنجەرەی فێربوونی ماتماتیك و لۆژیك لە تەمەنی سێ ساڵی دەست پێدەکات و لە شەش ساڵیش دادەخرێت.

لێرەوە گرنگی (٢-٤) ساڵی تەمەنی منداڵ بە دەردەکەوێت کە پێویستە دایك و باوك و مامۆستاش بە گرنگی وەربگرن لە بایەخ دان بە منداڵ لەو تەمەنانەی پەنجەرەکانی تێدا دەکرێنەوە سیستەمی فێربوونیش لە سەر ئەو بنچینە زانستیانە دارێژرێتەوە.

بەستنەوەی زانیاری نوێ بە هی کۆن:

فێربوونی زانیاری نوێ پەیوەندیەکی زۆر بەهێزی بە زانیاریە کۆنەکانی کە لە مێشکدا هەڵگیراون هەیە، ئەو زانیاریە کۆنانە وەك فلتەرێك بۆ فێربوونی نوێکان کاردەکەن، ئەو شتانەی مانادارن مێشك هەڵیان دەگرێت و ئەوانەی بێ ماناشن پشت گوێیان دەخات، چونکە مانابەخشین رۆڵێکی یەکجار گرنگی هەیە لە فێربوونی زانیاری و کارامەیی و هەڵگرتنیان لە مێشك. بۆ نمونە ئەگەر قوتابی مانای ئەو شتانەی فێریان دەبێت نەزانێت ئەوا ئەو زانیاریانە بۆ ماوەیەکی درێژ لە مێشکی نامێنێتەوەو وەبیرهێنانەوەی ئاسان نابێت. لەگەڵ ئەوەی توێژینەوەکان دەریان خستوە کە مامۆستاکان ٩٠٪ی کاتی وانەکانیان بۆ ئامۆژگاری کردنی قوتابیان تەرخان دەکەن تا ئامانجەکانی فێربوونی وانەکان بزانن، کە ئەمەش شتێکی باشە، بەڵام هاندانی مێشکی قوتابیان تا هەوڵی فێربوون بدەن لەگەڵ روون کردنەوەی ئامانجەکانی فێربوون تا لە مێشکیان جێگیر ببێت بێگومان کۆششێکی زیاتری لە لایەن مامۆستا پێویستە. مانا بەخشینیش مەرج نیە هەر ئەو مانایانە بێت کە ئێمە وەك مامۆستا فێری بوینە کاتێك

**ئەگەر قوتابی مانای ئەو شتانەی فێریان دەبێت نەزانێت ئەوا ئەو زانیاریانە بۆ ماوەیەکی درێژ لە مێشکی نامێنێتەوەو وەبیرهێنانەوەی ئاسان نابێت**

منداڵ بوین، بەڵکو لەوانەیە شێوازێکی جیاوازتر لە مێشکی قوتابیان وەربگرێت. بۆیە بەستنەوەی زانیاریەکان بەیەکتر روون کردنەوەی گرنگی زانیاریەکان لە داهاتوو زۆر گرنگە بۆ چەسپاندنی زانیاریەکان لە مێشکی قوتابی.

توێژینەوەکان دەریان خستوە کە بەشێوەیەکی چاکتر فێر دەبین ئەگەر بەشداری ئەو چالاکیانە بین کە جۆرە بەربەرەکانێیەکی تێدا بێت. راستیەکانیش ئەوەیان دەرخستوە کە قوتابیان زۆربەی کاتەکان بە هێمنی دادەنیشن و بۆ ماوەیەکی درێژ و بەشێوەیەکی سەلبی گوێ لە مامۆستا دەگرن. مامۆستاش بۆ ئەوەی بەشداربوونی قوتابیان دەستەبەر بکات پێویستە شێوازی جۆراو جۆری هەستیارەکان بەکار بێنێت (Multisensory Approach). پێویستە ژوورەکانی خوێندن شیاو بن تا مامۆستاو قوتابی بتوانن گفتوگۆ لەسەر وانەکان ئەنجام بدەن. مامۆستاش پێویستە دەرفەتی جووڵەو راوەستانی قوتابیان لە ژوورەکە بدات، چونکە چوونی خوێن بۆ مێشك لە کاتی راوەستان بە لە ١٥٪



زیاد دەکات و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیش فێربوون ئاسانتر دەکەن.

توێژینەوەکان جەخت لە سەر کورتی ماوەی وانەکان دەکەنەوە، چونکە فێربوون چالاکتر دەکەن. بۆ نمونە: قوتابیان ئەو ئەو وانەیەی ماوەکەی تەنها ٢٠ خولەکە ئاسانتر بە بیریان دێتەوە لە وانەی درێژتر.

لەگەڵ بەناو ساڵ چوون توانا بایۆلۆژیەکانیشمان بەرەو گۆران دەچێت، ئەو گۆرانکاریانەش بەرپرسن لە دیارکردنی توانای عەقلیەکان، ئەمەش جیاوازە لە نێوان گەنجان و منداڵان. بۆیە بابەتەکانی چارەسەرکردنی کێشەکان پێویستە زیاتر بۆ گەنجەکان باس بکرێت.

سەبارەت بە کاریگەری خواردن و نوستن و لە بەبیر هاتنەوەی زانیاریەکان لە نێوان کچان و کوران. هەردوو زانایان کیرسی و بایتز (Keirsey and Bates) دەڵێن: چۆنیەتی ژیانی تاکەکان و پلەی گەرمی هەر لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییەوە ئاراستەی چۆنیەتی فێربوون و وەرگرتنی زانیاریەکان دەکەن.

توێژینەوەکانی هەریەك لە (Atakent & Akar) دەریان خستوە کە: مێشك ١٠٠ بلیۆن خانە دەماری تیادایە کە لە دروست کردنی تۆرە دەمارەکان کاردەکەن کە رۆڵی سەرەکی دەبینن لە فێربوون. هەروەها ئەو مێشکە ئامادەکاری تیادایە بۆ بەربەرەکانێ و حەزکردنی لە شتی زەحمەت بۆ فێربوون.

سەرچاوەکان:

1- Please Understand Me: Character and Temperament Types
David Keirsey, Marilyn Bates
2-Atakent, A. & N. Z. Akar. «Brain-Based Learning: Another Passing Fad?», European Languages Conference, Lesvos, Greece, September 2001.

# قوتابیەک
# دایک و باوکانی خستە گریان

**ئەم وتارە لە کۆبوونەوەی دایباب لە قوتابخانەی گوڵانی بنەڕەتی لە پایتەخت لەلایەن قوتابی بەهرەمەند [عمرنجم الدین] پۆلی شەشەمی بنەڕەتی خوێندرایەوە کە بووە جێگای خۆشحاڵی ئامادەبوان، ئێمەش لە گۆڤاری ژیار بە پێویستمان زانی ئەم خۆزگە جوانانە جارێکی تر بخەینەوە بەر دیدی دایکان و باوکان و خوێنەرانی خۆشەویست.**

دایکان باوکان. خۆشەویستانی دڵە پڕ لە ئومێدەکانمان، ئێمەی منداڵ باش ئەو ڕاستیە دەزانین، کە ئێوەی ئازیز بەقەد گلێنەی چاوەکانتان ئێمەی جگەرسۆزتان خۆش دەوێ، ئێمە دەزانین ئەگەر ئێوە حەز نەکەن کەس لەخۆتان بەرزتر بێت، بەڵام شانازی دەکەن ئێمەی جگەرتان لەئێوە باڵاتر بین لەژیان، هەربۆیە جوامێرانە شانتان داوەتە بەر ئەو هەموو ئازارو زەحمەتیانە، گیانمان قوربانی فیداکاریتان، ئەودەمەی ئاوات و خۆزگە کەسیەکانتان لە پێناوی ئێمە فەرامۆش دەکەن، زۆرن ئەو ساتانەی پێداویستیەکانی ڕۆژانەتان لەبیر خۆتان دەبەنەوە و تا ئێمەی پێ پۆشتە بکەن.

دایەو بابەکەم، قوربانی هەموو ئەو فرمێسکانەتان بم کە لە تاریکی شەوا بەدیار لاشەی پڕلە ئازاری ئێمەدا لە چاوەگەشەکانتان تک تک دەتکاو دەستی پڕلە نزاتان بۆ ئاسمان هەڵدەبڕی و دەتان ووت: خوایە گیان ئەم دیاریە ڕازاوەمان زوو بۆ چاك بکەوە...ئەی خوایە گیان.



ئێستا شوکر بۆ خوا ئێمە گەورەبوین و هاتوین بۆ قو تا بخا نە ، ئێمە ئێستا زۆر گرنگین. جێی بایەخین، چونکە نەوەی دوارۆژین. ببینن ئەو باڵەخانە بەرزانە، کە قوتابخانەی لانەی فێربونە، بۆ ئێمە دروست کراون، ئەها ئەو هەموو فەرمانبەرە بەرێزو مامۆستا دڵسۆزانە هاتون لە پێناوی پێگەیاندنی ئێمەدا بەهاری ڕازاوەی تەمەنیان وەك مۆم دەتوێننەوە.

ئێمە گرنگین، ئەوەتا هەمووتان ئەمڕۆ بۆ قسەکردن لەسەر ژیان و دوارۆژی ئێمە کۆبوونەتەوە، ئێمە شەرمەندەی ئەو هەمو پاکی و دڵسۆزیەتانین. هەمیشە لە خوا دەپاڕێینەوە لە نیعمەتی ووشەی پڕلەچێژی دایەو بابە بێبەش نەبین.

مامۆستاکانیشمان وەك ئێوە بەخشندەن زۆر جار بێ نازی و ناپۆشتەیی یەکێك لە ئێمە، یان یەتیمیمان دەبێتە تەوقی میهرەبانی گریان و گەروی زوڵاڵیان دەگرێ، گەرچی هەوڵ دەدەن نەگریەن تا عەزمی ئێمە نەڕوخێ. بەڵام کانی چاوەکانیان میهربارانمان دەکەن.

گریانی تۆ مامۆستاکەم نمەی بارانی بەهارەو لەسەر ڕۆحمان خۆشەویستی و دڵسۆزی دەڕوێنێ.

هۆ دایە گیان، بابەگیان ڕێم پێبدەن لەم دەرفەتەدا هەندێك لە ئازارەکانی ناخمان بۆ ئێوەی بەڕێز دەربڕین. تا ئێوەو هەموو خەڵکیش بە مەینەتیەکانمان بزانن.

* مامۆستا لەوانەی مافی مرۆڤدا

پێی وتین زانایەك دەڵێت: گەورەترین کار کەپێویستە باوك بۆ منالەکانی بکات، ئەوەیە کە دایکیانی خۆش بوێت و ڕێزی لێبگرێت.

بەڵام بەداخەوە زۆر جار هەست دەکەین بەهۆی زاڵ بوونی کەلتوری سەقەتی کۆمەڵگاوە بێڕێزی بە دایکانمانەوە دەکەن، باوکەگیان چۆن دەبێ وتەی ناشایستە بەو کەسە بڵێی، کە نۆمانگ ئێمەی بەمیهرەبانی خۆی لە هەناویا هەڵگرتوە؟!!

من نازانم چۆن ڕێگە بەخۆتان دەدەن ووتەی سوك بەیەکێك بڵێن کە پێغەمبەر (د.خ) لەسەر بێت لە دەرهەقیا دەفەرموێت ((بەهەشت لە ژێر پێی دایکانە)).

* بابە گیان زۆربەتان هەمیشە توڕەن، کاتی پیرۆزی خۆتان بە شتی لاوەکی بەسەردەبەن، زۆر بەئاسانی دەبنە برادەری خەڵك، بەڵام نایەن ببنە هاوسۆزو برادەری ئێمە، باوەشی ئەوینمان بۆ بکەنەوە تا لە ئازارەکانی ژیان ڕزگارمان بێت و لەوێدا ئۆقرە بگرین، بۆ دەتانەوێ هەمیشە ماڵەکانمان لێبکەن بەسەربازگە و تەنها نەغمەی (بکەو مەکە)ی لێ بێت!!؟

بەشێکیشتان کە دێنەوە ماڵ دوای کارو کاسبی، باشترین دیاری دەستان دوکەڵی جگەرەیە!! ئێوە گەر خۆتان خۆش ناوێ، منی منال تاوانم چیە بەدوکەڵی ئارەزوی ناتەندروستی ئێوە بخنکێم!!؟

من لەگەڵ هەر جگەرەیەکی تۆدا هەست کردن بە وجودی خۆم لەلا کاڵتر دەبێتەوە.

ئیمە ناسکین وەك شۆڕەبی کاتێك بای ئارەزوو دەمان جوڵێنێ و دەمانخات، ئێوە نایەن بە ئارامی ڕاستمان بکەنەوە، ئای بابەو دایە چەند ڕقم لەو وشانەیە کە هەمووجار دەڵێن (تۆ نابی بەهیچ) یان (تۆ فاشیلی) یان (داری کفر هەر لەسەر زەوی دەبێت و نابێت بە کاریتە).

**زۆر بەئاسانی دەبنە برادەری خەڵك، بەڵام نایەن ببنە هاوسۆزو برادەری ئێمە، باوەشی ئەوینمان بۆ بکەنەوە تا لە ئازارەکانی ژیان ڕزگارمان بێت و لەوێدا ئۆقرە بگرین**

بەڵام ئازیزانم بزانن ئێستا سەردەمی زانست و تەکنەلۆژیایەو داری کفر زۆر بە ئاسانی دەبێت بەکاریتەو، ئێمەش بە پشتیوانی خوا، پاشان هەوڵی ئازیزان دەبین بە خەمخۆری وڵات، دەبین بەوەزیر، دەبین بە سەرۆك، دەبین بە مامۆستا...

دواجار دەمەوێ بەئێوەی ئازیز ڕابگەیەنم، ڕاستە ئێمە منالین، بەڵام هەست و نەستمان زۆر گەورەیە، زۆر بەئاسانی هەست بە هەڵەو کەم و کوڕیەکانتان دەکەین، بەڵام کەقسە ناکەین (ناوێرین!؟) بۆیە وا مەزانن بێدەنگیمان نیشانەی تێنەگەیشتنمانە. بەڵکو وا فێرتان کردوین ئێمە بۆمان نییە قسە بکەین!

ئیدی ئەو بێدەنگیە بۆ زۆربەمان دەبێت بە دێوەزمەو تامردن بەرۆکمان بەرنادات!؟؟



ئێمە ئەمڕۆ بەکامێرای چاوە گەشەکانمان وێنەی کردەوەکانتان جوان جوان بە چاك و خراپەوە دەگرین، ئەگەر ئێستاش نەتوانین بچینە تاقیگە، ئەوا دڵنیابن سبەی لەتەمەنی (٢٠)ساڵی لە تاقیگەی ژیاندا هەموو وێنەی کردارو هەڵوێستەکانتان دەشۆینەوە و بە عەقڵی گەورەییمان هەڵی دەسەنگێنین، ئیتر ئەوسا وێنە جوانەکان دەبن بە وانەی پراکتیکی و هەڵیاندەواسین لە سەر دیواری ژین، وێنەکانی تریش دەبنە ئازاری ویژدان و ڕۆحی شکۆمان لاواز دەکەن.

دایە گیان ئازیزەکەم دەتۆش لە پێناوی گەورە بوونی مەردانەی ئێمەدا زیاتر ئارام بگرەو مەیەڵە لەسەر هەندێ داواکاری تایبەت ماڵەکەی باغی بەهەشتمان لێ ببێت بە دۆزەخی ئەبەدی، چونکە ئەوسا ئێمە دەسوتێین بە گوناهێك کە ئەنجاممان نەداوە.

باوکە گیان تۆش ئارام گریە لەگەڵ ئێمەو لەگەڵ داواکاریەکانی ژیان، چونکە جوامێری و شکۆو هێزی مرۆڤ لە ئارامگریەکەیدایە نەك پێچەوانەکەی.

ڕاستە دیاری و یاریە پلاستیکیەکان تا ئەندازەیەك دڵخۆشمان دەکات، بەڵام ئەوە بزانن ئەوان بێ سۆزو بێگیانن، هەرگیزاو هەرگیز جێگای چرکەیەك لە سۆزو خۆشەویستی ئێوە ناگرنەوە، بۆیە پڕ بەدڵ تامەزرۆی سۆزو میهرەبانی و باوەشی گەرم و خەندەی لێوو قسەی پڕ لەسۆزو شیرینتانین، توخوا دایەو بابە تا بچوکین وجێگەمان دەبێتەوە لە باوەشتان تێر لە باوەشمان بگرن، تا ئێمەش خۆزگە گەورەکانی ئێوەو نەتەوە ئازادیخوازەکەمان بەشکۆوە لەباوەش بگرین.



# پرۆژەی پەروەردەو فێرکردن و فەلسەفەی بونیادی مرۆڤ

نوسینی: بەفرین عبدالله اسماعیل

پرۆسەی پەروەردە لە بنچینەدا پرۆسەیەکی ئاڵۆزو ڕایەڵەییە، بنچینە گەلێکی زۆر هاوکارن لە بونیادی چەمك و فەلسەفەکەیدا، لە پێناو سەرکەوتنیدا ڕایەڵەیەکی شارستانی دادەمەزرێنێ و لە هەمبەریدا پرۆسەی پەروەردە دەکات بە چوارچێوەی سەرەکی بۆ دامەزراندنەکەی.

ئەو فەلسەفەیە لە ڕوانگەی کۆمەڵگەکەمانەوە بەشێوەیەکی ناتەواو وەردەگیرێت، کاتێك لە روانگەی پلەبەندی زانستیەوە بۆ تاکەکان بە پێوەری زرینگی ماتماتیکیانە یان زیهنی وەك ئەوەی کە بونیادی مرۆڤ تەنها وەدەست هێنانی [فول مارك]بێت لە بابەتەکانی خوێندن، خۆ ئەگەر ئەو کەسە وەك هزری و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی هەرسیش بێنێت، ئەوا شتێکی ڕواڵەتیەو پێیان ئاسایە هەمو ئەمانە بەجۆرێك لە جۆرەکان شتێك دەخەنە ڕوو، ئەویش ئەوەیە کە پەروەردەو فێرکردن لە خودی خۆیدا پرۆسەیەکە بۆ پێگەیاندنی مرۆڤ لە ڕووی جەستەیی و ڕۆحی و ئاوەزەوە.. بەو واتایەی کە پەروەردەو فێرکردن بۆ بەرەو تەواوی ڕۆیشتنی سروشتی مرۆڤ، بەئاڕاستەی ئامانجە کۆمەڵایەتیەکان لە پێگەیاندنی تاکێکی کاریگەر لە ژینگە مرۆییەکەدا. هەمیشە گرفت و کێشەکانی کۆمەڵگە تازە پێگەیشتوەکان خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە تاکەکانی کۆمەڵگە خۆیان لە پێشتر دەگرن لە پرۆژەکانی سیستەماتیك، بە پێچەوانەی کۆمەڵگە پێشکەوتوەکان کە تاکەکانیان سیستە ماتیکیانە کار دەکەن. داهێنان و زرینگی و بلیمەتی کاریگەری نابێ ئەگەر بەگەڕ نەخرێت کە لەگەڵ بنچینەکانی دیکە وەك فاکتەرێکی تەواوکەر لە بەسیستەماتیك بوونی بونیادی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆیی. هاوڕێیەکی نزیك کە لە وڵاتە یەکگرتوەکان سەرقاڵی خوێندنی پزیشکی ناوەکیە لە یەکێك لە زانکۆکانی [دیترۆیت] بۆی گێڕامەوە وتی لەنێو کۆرسەکانی خوێندندا، کۆرسێك تەرخان کراوە بۆ زانستە سیاسیەکان کە زانیاری دەربارەی سیستەمی سیاسی ئەم وڵاتە بەقوتابی دەدات، ئەمە لە کاتێکدایە کە قوتابیەکە خوێندکاری کۆلێژی نوژداریە.. لێرەدا خاڵی سەرنج ڕاکێش ئەوەیە کە نابێت پزیشك لە سیستەمی سیاسی وڵاتەکەی و لە دەرەوەی هاوکێشە سیاسیەکان لانی کەمی بەشدار بێت لە بڕیاردان، هەرکە بەشداری دەکات لە دەنگ دان و هەڵبژاردنەکان، کە پەیوەستە بە ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانی...! بۆیە دەمەوێ بڵێم ڕایەڵەو هێڵە سەرکەوتوەکانی پەروەردەیی لەوە دەبینرێت کە مرۆڤ بپەڕێنێتەوە و ڕزگاری بکات لە کەنارێك لە کەنارەکانی ژیان، زۆر لاشتان سەیر نەبێ کە دەڵێین زۆرێك لە داهێنەران و بلیمەتانی پسپۆڕی زانستی و ئەدەبی لە دانیشگەکانی خوێندن سەرکەوتوو نەبوون

به پیوەری دامەزراوەیی. بەڵام هەمان ئەو پێوەرە باوانە هاریکار بوون بۆ سەرکەوتنیان. لە دەرەوەی ئەو دامەزراوانە بۆیە کە ڕۆشنایی دەخەینە سەر فەلسەفەی پەروەردەیی. مەبەست لێی تەنها میکانیزم و هۆیەکانی گەیاندنی زانیاری و ڕاهێنان نییە بە مرۆڤ، بەڵکو بایەخدانە بە دەستاو دەسکردنی پەروەردەییانە [چ لە ڕێگەی گفتوگۆی ڕووبەڕوو یاخود لە ڕێگەی پێم بدە، لێت وەردەگرم] پاشان تێکهەڵکێشانی بە بنچینەکانی دیکەی پرۆژەی پەروەردەیی لە پێناو پێگەیاندنی مرۆڤێکی تەندروست.

لە دیدو بۆچونی ئێمە لە پێناو بەتەواو گەیاندنی پرۆسەی پەروەردەیی، دەبێ ئەم بنچینە سەرەکیانە لەبەر چاو بگیرێت.

## یەکەم - دروستکردن و پێگەیاندنی تاک [البناء الفردی]

لەم حاڵەتە ئاراستەیەك دەگیرێتە بەر بەجۆرێك کەڕۆشنایی دەخاتە سەر هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەستە بە ئاراستە کردنی سروشت و داهێنانەکانی مرۆڤ.

ا-کارکتەرەکانی ئەقڵ و ئاراستەکردنی [اعمال العقل وتوجبهه] کەمەبەست لێی بنیات نانی زانستیانەو هزریانەیە.

ب - کاراکتەرەکانی هەست و سۆز و بژارکردنی بەرەو باشترو چاکتر. مەبەست لێی پرانسیپە بەرز و پڕبەهاکانی بە زەیی و لێبوردەیی.

ج — پەراوێز خستنی بەرچەرتەنگی [حسد] ئەوەش لە ڕێگەی هەوڵ و کوشش و شەونخونی بەردەوام لەگەڵ جەمسی گیانی خۆشەویستی لە بری رق و کینە.

## دووەم بونیادی ئەخلاقی

کە باس لە پرۆسەی پەروەردەیی دەکەین، ئەوا بونیادی ئەخلاقی بە بنچینەیی و سەرەکی ئەو پرۆسەیە دێتە هەژمار، بۆیە پێویستە لە پرۆسەی پەروەردەیی ڕەچاوی بونیادی ئەخلاقی بکرێ مەبەست لە ئەخلاق. پتەوکردنی باوو نەریتە تەندروستەکان و پرانسیپە ڕاست و دروستەکانی کۆمەڵایەتی و وەلاوەنانی بەدڕەفتارییە لەم بارەیەوە پێغەمبەر [درودی خوای لێبێ] واتاو چەمکی پەیامەکەی پێغەمبەرایەتی لە بوونیادی ئەخلاقی کورت کردۆتەوە بەم وتەی کە دەفەرموێ ((من نێردەیەکم بۆ تەواوتر کردنی ئاکارە جوانەکان)).

**ڕایەڵەو هێڵە سەرکەوتووەکانی پەروەردەیی لەوە دەبینرێت کە مرۆڤ بپەڕێنێتەوە و ڕزگاری بکات لە کەنارێك لە کەنارەکانی ژیان**

## سێیەم بونیادی کۆمەڵایەتی

ئەو خاڵەیان تاوتوێی هەموو ئەو پەیوەندیانە دەکات کە باسی ڕایاڵەی کۆمەلایەتی و گیانی بە یەکەوە ژیانی کۆمەڵگەو هەموو بەهاکانی دیکەی کە ڕۆڵەی بەتین و بەهێزن لە ڕەچاو کردنی پرسییە باوەکانی کۆمەڵایەتی و پەرستنی بەرۆژ یەکێتی.

## چوارەم بونیادی مێژوویی



ئەوەیان لەو جوغزە پرانسیپ و ڕەهەندە مێژووییانە دەدوێ کە ئەوەکانی دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەی بەیەکەوە دەگەیەنێت. وێڕای ئەوەش فاکتەری یاریدەدەرە لە دیاری ڕۆڵی مێژوو لە دروستکردنی ئایندە. بۆیە پرۆگرامی پەروەردە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا هەمیشە هاریکار بووە لە شانازی کردن بە مێژوو و ڕەمزەکانی مێژوو.. تا وای لێهاتوە ئەم شانازی کردنە بە ڕمزەکانی مێژوو لە نێو هەندێ توێژی خوێندەوار و قوتابیانی ئەوروپی شتێك دەربارەی بزاڤی مێژوو هەزم ناکەن. مەگەر لە نێو چوارچێوەی مێژووی ئەوروپاوە نەبێت وەك ئەوە وابێ کە جگە لە شارستانیەکانی ئەوروپی. شارستانیەتی دیکە لە ئارادا نەبوو بێت.

## پێنجەم- بونیادی جوگرافی

ئەم خاڵەیان لە هەموو ئەو شتانە دەدوێ کە پەیوەندیان بە جوگرافیای مرۆڤ و ژینگەکەیەوە هەیە. هەروەها لە بنەماکانی جوگرافیای سیاسیش دەکۆڵێتەوە کە خودی میللەت کۆ دەکاتەوە.

## شەشەم- بونیادی کەلتووری

دوا خاڵ لەو بنچینە سەرەکیانە کە پێویست و گرینگە لە بواری پەروەردەو فێرکردن لە بەر چاو بگیرێت بوونیادی کەلتوورییە. ئەوەشیان لە هەمو ئەو شتانە دەکۆڵێتەوە کە پەیوەندی هەیە بە پاراستنی بنەماکانی شارستانی و فەلسەفی کۆمەڵگە.. ئەوەشیان خۆی لەژێرخانی زمانەوانی و رامیاری و ئابووری دەنوێنێت. وەك فاکتەری یاریدەدەر لە بەشداری تاکەکانی نێو کۆمەڵگەوە لە دروستکردنی بڕیارو دامەزراندنی نەتەوە.

# پرۆسەی دڵنیایی جۆریی وەزارەتی خوێندنی باڵا




سەلام ناوخۆش/ پرۆفیسۆری یاریدەدەر

**دەروازەیەک:**

سیستەمی خوێندن هۆکارێکە بۆ رزگاری کردنی نەوەی نەتەوەیەکی داگیرکراو و روخاو. لەو کەناڵەوە دەسەڵاتی سیاسی و مەدەنی دەتوانێ لە ڕێگای فەلسەفەی پەردەوەردەییەوە بنیادنانی نەتەوە دابمەزرێنێتەوە.

لەمێژووی کەوتنی یان هەرەسی سیاسی وعەسکەری یابان وئەڵمانیا وکۆریا چەند وانەیەك هەیە بۆ هەر نەتەوەیەك کە بیەوێ جارێکە تر لە(کەوتن) (ڕوخان) بەهێزەوە هەڵبستێتەوە.

سیاسەتمەدار و عەسکەرتاریەتی ئەو وڵاتە وڵاتیان کردە چەند بەشێك و گەورەترین باجیان بە هاوڵاتیانی خۆیان دا، بەڵام پەروەردەکارانی ئەو وڵاتانە توانیان لەڕێگای فەلسەفە پەروەردەیی و سیستەمی پەروەردەیی، وڵات بە ئاراستەیەك داببەن کە دەوڵەتی زۆر بەهێز تر لەسەر ئاستی جیهانی بونیاد بنێنەوە. وێرایی ئەمەش هەر ئەو عەقڵیەتە مەدەنیە بوو توانی بەتەکنەلۆژیای سەردەم هێندە پەرە بە ئابوری وڵات بدەن کە لە داگیرکارانی خۆیان پێشکەوتووتر بن.

لەم کورتە نووسینە هەوڵ دەدەین هەندێ رۆشنایی بخەینە سەر سیستەمی نوێی وەزارەتی خوێندنی باڵا وئاستەنگەکانی بەردەم پرۆسەی دڵنیایی جۆریی،کەلە دیدگای وەزارەتەوە بەیەکێك لە ستراتیژە گرنگەکان دادەنرێت.

## پرۆسەی دڵنیایی جۆریی

ئەم پرۆسەیە ئەکادیمیە لەسەر چەند بنەمایەکی زانستی دامەزراوە. ئەم پرۆسەیە خۆی لە چەند چالاکیەك دەنوێنێ کە هەوڵ دەدات وەڵامی گشت پرسیارە گرنگەکان بداتەوە لەوانە دڵنیاکردنی زانکۆ وپەیمانگاکان لە پێدانی بڕوانامەیەکی ئەکادیمی متمانەکراو هەروەها دڵنیا کردنی قوتابی لە(جۆری خوێندن)و لە (جۆری گۆتنەوە) وێرایی ئەمەش لەم پرۆسەیەدا قوتابی دەبێتە بەشێکی کارا لە تۆری دەسەڵاتی سیستەمی پەروەردەیی.

لەنێو ئەم سیستەمەدا مامۆستا ناچار دەبێ لەڕێگای خوێندنی بەردەوامەوە هەم سمینار پێشکەش بکات و هەم لە سمینارەکان ئامادەبێ هەروەها لەنێو ئەم سیستەمەدا شۆرشێك لە دژی (مارکەر) بەرپا دەبێ وڕۆڵی کەم دەبێتەوەچونکە مامۆستا ناچار دەبێ وانەکان بە(لاپتۆب) و (داتاشۆ)بڵێتەوە!

## لایەنە پۆزەتیڤەکانی پرۆسەی دڵنیایی جۆریی

وەزارەتی خوێندنی باڵا هیچ سیستەم و پرۆگرامێکی نەبووە کەلەسەر شەنگست و بنەما دامەزرابێ هەر ئەوەش وای کردووە هەر مامۆستایەك لە کۆلیژێك، بەشێك بە ئارەزووی خۆی وانەکان

بڵێتەوە لەم ڕوانگەوە دڵنیایی جۆریی و خوێندنی بەردەوام دوو پرۆسەی نوێ بوون! ئەو(نوێ) بوونەش زۆر هەنگاوی پۆزەتیڤی لێکەوتەوە لەوانە:

١-دیارکردنی بابەتەکانی ساڵی خوێندن syllabus

٢-بە پرۆگرامکردنی بابەتەکان و چاودێری کردنی مامۆستا

٣-شێوازی گوتنەوەی بابەتەکان

٤-دیاریکردنی میکانیزمی گوتنەوەی بابەتەکان

٥-سەپاندنی پرۆسەی فیدباک feedbak

٦-کێشانەوەی دەسەڵاتی موتڵەقی مامۆستا بەسەر چارەنووسی قوتابی

٧-بەشداریکردنی قوتابی لە پرۆسەی خوێندن وەهەتا فیدباک کردنی مامۆستا

### ئاستەنگەکانی بەردەم پرۆسەکە

بێگومان چەندەها ئاستەنگ لەبەردەم پرۆسەکە هەن. لەلایەك هەم خودی پرۆسەکە ڕونیا (vision)و پەیامی (message) تەواو روون نیین هەتا وەزارەتیش وەڵامی پرسیارەکانی زەینی پرسیارکەرانی لانییە ئەم خاڵە چەند گرفتێکی بۆ پرۆسەکە دروست کردووە جۆرێك لەنا متمانەیی لە هەمبەر پرۆسەکە بەرپاکردووە.

بەشی دووەمی گرفتەکە پەیوەستە بە:

١- دەسەڵاتی حیزب بە زانکۆ ودام ودەزگاکانی بە حوکمی ئەوەی وەزیر سەر بەباڵێکی یەکێتیە ئەوە پرۆسەکە لە زانکۆکانی هەرێم بە نیوەچڵی پەیڕەو دەکرێ ئەوە بیست ساڵەهەردوو حیزبی دەسەلات بە شێوازێکی ڕۆژهەڵاتیانەی دواکەوتوو مامەلە لەگەڵ زانکۆ دەکەن پۆستەکان لە(سەرۆکی بەش)ەوە هەتا (سەرۆکی زانکۆ) لەبارەگاکانی حیزب

## بەشێ لەمامۆستایانی زانکۆ هێندە لەگەڵ مۆدیلی کۆن ڕاهاتوون ناتوانن بە ئاسانی لەو تۆرە جالجالۆکە بێنە دەرەوە

دیاری دەکرێ و هیچ پۆستێك لەو پۆستە ئەکادیمی وکارگێڕییانە لەسەر بنەمای ئەکادیمی کەسی ئەکادیمی بۆ دیاری ناکرێ بەڵکو لەسەر بنەمای حیزبی کەسەکان دیار دەکرێن جا ئەگەر ئەو پۆستدارانە لەگەڵ وەزیر دۆست نەبن ئەوە هیچ بڕیارێکی وەزارەت جێ بەجێ نابێ لەهەر لەو روانگەوە لە هەندێ کۆلیژ هەردوو پرۆسەی دڵنیای جۆریی و خوێندنی بەردەوام هەرکاری پێ ناکرێ هەتا دکتۆرێکی (قسەخۆش)دەڤەری کەسك وتی: ئەو دوو پرۆسەیە شمولی ئێمە ناکات چونکە ئێمە (قری ارياف)ین.

هەر لەناویەك زانکۆش چەندەها کۆلیژ یان پەیڕەوی ناکەن یان بە نیوەچڵی پەیڕەوی دەکەن. جا هەتا مۆتەکەی حیزب بەسەر زانکۆ و وەزارەتەوە بێ ئەوە تەمەنی ئەو پرۆسەیە هێندە درێژ و بەردەوام نابێ!

٢- ئاستی مامۆستا وبیرکردنەوەی مامۆستای زانکۆ

بەشێ لەمامۆستایانی زانکۆ هێندە لەگەڵ مۆدیلی کۆن ڕاهاتوون ناتوانن



بە ئاسانی لەو تۆرە جالجالۆکە بێنە دەرەوە چونکە لەناو پرۆسەی دڵنیایی جۆریی و خوێندنی بەردەوام دا مامۆستا ناچار دەبێ چالاك _active_ بێ نەك سست_passive_ هەروەها هەتا ئێستا بەشێ لە مامۆستایان هیچ ئاگایان لە دنیای زانیاری سەردەم نییە بۆیە هەموو هۆکارێك بەکاردێنن بۆ ئەوەی شکست بەو دوو پرۆسەیەبێنن!

### ئەنجام

زانکۆنەك هەر لە ڕۆژئاوا، بەڵکو لەبەشێکی ئاسیاش مەڵبەندێکی مەعریفی و هۆکارێکی زانستیە بۆ پەرەپێدان و پێشخستنی پرۆسەی بیناکاری مەعریفی و تەکنەلۆژیایی وهەتا بونیاتنانەوەی تاکەکانی نەتەوە. ئێمەی کورد بە حوکمی ئەوەی مێژوونکە خاوەنی دەسەڵاتی سیاسی خۆمان نەبووین و هەروەها لە ژیانی سیاسیدا هەرتوشی شکستی عەسکەری و سیاسی بووین ئەوەچاوەڕێ بووین لە ناو قەڵەمڕەوەی حکومەتی کوردیدا هەردوو وەزارەتی پەروەردەو خوێندنی باڵا دوور لەدەسەڵاتی حیزب بن و ببنە پێشەنگ لە بونیاتنانەوەی کەسایەتی نەتەوەیی و ئەکادیمی و تەکنەلۆژیی نەوەی نوێ بەڵام ئەفسوس ئەو دوو وەزارەتە پرۆسەی پەروەردەیی و خوێندیان زۆر ئالۆز تر کرد بە جۆرێ لە پەروەردە هەر ساڵەو سیستەمێك جاڕ دەدرێ لە خوێندنی باڵاش هەدوو پرۆسەی دڵنیایی جۆریی و خوێندنی بەردەوام نەیانتوانی هیچ گۆرانکاریەکی ئەوتۆ بەرپا بکەن. لێرەوە گرنگە عەقڵیەت و بیرکردنەوەی سیستەمی سیاسی و فەلسەفەی سیاسی بگۆڕێ نەك تەنها گۆڕانی میکانیزمی وانەوتنەوە!



# پەروەردەی دروست هێمای سەرکەوتنی دواڕۆژ

نوسینی: پەری عابد *

پەروەردە بەشێکی سەرەکییە لەجەستەی مرۆڤ نەبوونی یاخود کەموکوڕی لەولایەنە بۆشاییەکی گەورە دروست دەکات لە کەسایەتی مرۆڤدا دەرەنجامی بەزیان پڕئەبێتەوە «بنیات نانی بناغەی کۆمەڵگایەکی پتەو لەپەروەردەکردنی نەوەکانییەوە دەست پێدەکات لەم بوارەدا نەك تەنها خێزان بەڵکو هەموو لایەنەکانی تری کۆمەڵگا بەرپرسن لە هەڵبژاردنی باشترین ڕێگا بۆ پەروەردەکردن. لە سەردەمی ئەمرۆدا لەگەڵ بەرەوپێشچونی باری ژیان و تێکەڵ بوون بە زانست و تەکنەلۆژیای نوێ ڕۆژ بە ڕۆژ کێشە کۆمەڵایەتیەکان لەنێو چینی هەرزەکاروگەنجدا ڕوو لەزیادبوون ئەکات. سەرەتای تەمەنی هەرزەکاری مەترسی توشبوون بەهەڵەی زۆری لێ ئەکرێت نەبونی متمانە وتێڕوانینی خراپی خێزان و کۆمەڵگا بەرامبەر ئەم چینە هۆکارەکەی خودی کۆمەڵگایەو ئەو ژینگەیەی کە منداڵ تێیدا گەشە ئەکات. ئەرکی پەروەردە کردن بەپلەی یەکەم لەئەستۆی خێزاندایە بەڵام تاچەند خێزان سەرکەوتووە لە بەڕێوە بردنی ئەم پرۆسەیەدا چونکە زۆر جار ئاوێتەبوونی خۆشەویستی منداڵ بە پەروەردەکردن وا دەکات لایەنی سۆزداری زاڵبێت بەسەر بینینی هەڵەکاندا تا دەگاتە ڕادەیەك لە دەرەوەی سنوری خۆیدا لێرەدا خێزان وەك جوتیارێك ڕۆڵ ئەبینێت لە پێگەیاندنی ئەو ڕووەکەی لەژێردەستیدا گەشە ئەکات. چاودێری کردنی بەردەوام وژینگەیەکی لەبار بۆی تاکێکی سەرکەوتوو پڕبەرهەمی لێ پەیدا ئەبێت کە کۆمەڵگا و کەسانی دەوروبەری لێی سودمەند ئەبن. ئەرکی خێزان لە پەروەردە کردندا بەرەو ئاراستەیەکی سەخت تر هەنگاو ئەنێت لە ئێستادا بە هۆی بێ ئاگایی کۆمەڵگا لە لەدەست چونی ئەو کۆششانەی چەندین ساڵە بۆ بەدەست هێنانیان هەوڵ ئەدات وە نەبوونی هاو دەنگی و یەکڕیزی لە نێو چینەکانی داو بردنی ئازادی و سەربەستی بەئاراستەیەکی هەڵەدا بە واتای ئەنجامدانی هەر کارێکی نە شیاو بەبێ ڕەچاو کردنی ئەو یاساو ڕێوشوێنانەی کە ئایینی ئیسلام و کلتوری نەتەوەی کورد دیاری کردوون. هەروەها نەبونی هۆشیاری و ڕێنیشاندانی خەڵك لەکاتی هێنانی هەر زانست و بیرێکی نوێ لەچۆنییەتی بەکارهێنانی وگونجانی لەگەڵ ئاستی ڕۆشنبیری خەڵکدا. قوتابخانەش وەك ماڵی دووەم و مەڵبەندی زانست و زانیاری ڕۆڵی سەرەکی ئەبینێت لە بنیات نانی کۆمەڵگادا چونکە پەروەردەو فێرکردن پێکەوە زنجیرەی تەواوکاری یەکترن و ئاستی سەرکەوتن لەو بوارەدا داهاتووی نەوەیەك دیاری ئەکات کە خاوەن پلەوپایەو ڕەوشتێکی بەرز بێت بۆ ئەوەی بتوانێ بە درێژایی تەمەن پارێزگاری لە ئایین و خاك و کلتوری وڵاتی خۆی بکات. بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە کەسانی پسپۆڕو کارامە دابنرێن کە ئەزمونیان هەبێت لە بواری پەروەردەو فێرکردندا. کلیلی سەرکەوتنی وڵاتی ئێمە لەدەستی خۆماندایە بەڵام دۆزینەوەی دەرگاکانی هەوڵ وکۆششی زۆری ئەوێت.با هەوڵ بدەین خەونی گەورە پیاوانی ڕابروو کەئازادی ئەم ڕۆژەیان بۆ ئێمە خولقاند بێنینەدی. ببینە پێشەوا بۆڕووناك کەرەوەی ڕێگەی نەوەی داهاتومان گەر خۆشمان توانای ئەنجام دانی کاری گەورەمان نەبێت هانی ئەو کەسانە بدەین کەتواناو سامانی خۆیان لەخزمەت کردنی وڵاتدا بەکار دەهێنن. باکەم وکوڕییەکانی پەروەردەکردن نەهێڵن ئەوکات خێزان وکۆمەڵگە بەمتمانەیەکی زۆرەوە لە چینی هەرزەکار و گەنج بڕوانن بەرامبەر بوونی گومان لێیان ئومێدی داهێنانی گەورەیان لێبکات بائامانجی تێکەڵبون وپەیوەندیمان لەگەڵ وڵاتانی جیهان بەدەست هێنانی زانست و پێشکەوتن بێت لایەنە باشەکانی ئەوان بەرجەستە بکەین وە خاڵەلاوازەکانیان لەبەر چاوبگرین بۆ چاکسازی وڵاتی خۆمان. لەم وڵاتەدا کاتێك منداڵێکی کورد گوڵێك دەچێنێ وە خوێندن ئامانجی سەرەکییە لای گەنج بێ جیاوازی ڕەگەز کاتێك قوتابخانەیەك لەسەر دەستی چەند مامۆستایەکی کورد بەهەڵگرتنی دروشمی پەروەردەو فێرکردن بنیات ئەنرێت ئەمانە هەموی پێکەوە سەرەتای شۆڕشێکن کە کاتی هەڵکردنی ئاڵای سەرکەوتن نزیکە گەر بەردەوام بێت لەبەدەست هێنانی ئامانجی سەرکەوتنی وڵات.

* قوتابی لە ئامادەیی ژیاری نمونەیی

# نەخشە ڕێگای پەروەردەیی



فەرهاد قادر ئۆمەر

زۆر لاتان سەیر نەبێت کە دەڵێم پەروەردە کارگەی ژیانە بەواتا بەرفرەوانەکەی ژیان.. کارگەیەك کاری پێگەیاندن وهێنانە بەرهەمی نەوەیەکی بەسوودی کارا وچالاکە. لەم دیدەوە بۆ پەروەردە هاوکێشەیەکی دیکە گەلاڵە دەبێ، ئەویش هەموو ئەو شتانەی دەبنە ڕێگرو بەربەست لەپێشڤەچوونی ڕەوشی پەروەردە، ئەوا دەرزێك دەخاتە کەشتیە تەندروستیەکەی ژیان، ئەویش لەکارکەوتنی ئەو کارگەیەیە کە نەوەیەکی تەندروست بەرهەم دەهێنێت لەرووی پتەویی جەستەو هزرو بیری ڕەوشەن.. بەمەش بەشێوەیەك لەشێوەکان جموجۆڵی ژیان دەوەستێت. پێویست ناکات لەم کورتە نووسینەدا سوود ولایەنە باشەکانی پەروەردە بخەمە روو، چونکە لەو بازنەیە دەرچووە ئێستا پەروەردە بناسێنین، بەڵکو ئێمە لەو قۆناغە تێپەڕیووین و زۆر لە شارەزایان وپسپۆرانی ئەکادیمی بەوردی لەو بازنەیە دواون و خستوویانەتە بەر لێکۆڵینەوە...

بەکورتی وبەکوردی ئەگەر چی ئێستاکە ئاراستەیەك لەئارادایە لەگرنگی وبایەخدان بەبواری پەروەردە لەکوردستان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانیوە پەروەردە لەتاکە تاکەکانی کۆمەڵگەوە بگوازێتەوە بۆ بەمیللی بوون، جگە لەخوێندن لەقوتابخانەکان کە تا رادەیەك دەتوانین بڵێین ئارەزوومەندی هەیە لەکوردستان، ئەویش بۆ بەدەستهێنانی هەلی کار نەك بۆ خۆ رۆشنبیرکردن وپێگەیاندن. بۆیە ئاماژە بەخاڵێك دەکەم، ئەویش فەرامۆشکردن وکەم بایەخدانی تاکی کورد بەچۆنیەتی بیر کردنەوەو تێڕوانینی بۆ ئەو کەشتیەی ژیان کە بواری پەروەردەو فێرکردنە.. رەنگە بەشێکی ئەم دیدە ناتەندروستانە لەئەستۆی هەلومەرجی سیاسی ورژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان ونەیارو ناحەزەکانی کورد دابێت، بەڵام بەشێکی وەبەر خودی هۆشیاری تاکی کورد خۆشی دەکەوێت.. هەموو ئەمانە وایانکردووە ئێمەی کورد نەك هەر لەپەروەردە دواکەوتوو بین، بەڵکو زانست وزانیاریشمان بەهەمان دەرد بردووە، بواری سیاسی وئابووریش لێی بێبەش نەبووە.. هەر بۆیە پێویستە ئەمڕۆ جارێکیتر چاو بەهەموو ئەو مەسەلە گرنگ وپڕ بایەخانە بخشێنرێتەوەو خوێندنەوەیەکی تەندروستی بۆ بکرێت بەتایبەتی پەروەردە. راستە ئێستا بایەخێکی باش بە بواری پەروەردە دەدرێت وچەندان قوتابخانەو کۆمەڵگەی مۆدێرنی پەروەردەیی وەك ئامادەیی و پەیمانگەی ژیارو هاوشێوەکانی لەهەرێمی کوردستان دەرکەوتوون وجێ پەنجەشیان دیارە لەپەروەردەو فێرکردنی، بەڵام هیواو خواستەکانی ئێمەی کورد زۆر لەوە زیاترە لەرۆژگارێکی وەك ئەمڕۆدا کە عەولەمە وشۆرشی زانیاری دنیای تەنیوەتەوە بەجۆرێك ئەو جیهانە گەورەیە بۆتە گوندێکی بچکۆلانە.. دیارە پەروەردەش لەو دنیایەدا زانستێکی سەربەخۆیەو راستەخۆ پەیوەستە بەئاراستەکردنی خودی مرۆڤەکان وکۆمەڵگە بەرەو ئاسوودەیی وبەختەوەری ژیان.. جا بۆئەوەی بگەین بەو ئاستەو شیاوی ئەوە بین لەو کاروانەی پێشکەوتن دوانەکەوین وشان بەشانی نەتەوە پێشکەوتووەکان لەپێشبڕکێی چاکترو باشتر

بەردەوام بین. پێویستە ئێمەی کوردیش خاوەن نەخشەو بەرنامەیەکی ڕوون ودیار بین لەدیاریکردنی نەخشەڕێگەی سیستەمی پەروەردەیی لەکوردستان، کە ئەمەش دەبێتە سەرەتای هەنگاو هەڵێنانێکی تەندروست بۆ ئەوەی خۆمان بخزێنینە نێو پێشبڕکێی ئەمڕۆی دونیای پەروەردەی هاوچەرخ. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئێمە پەلە لەکارێك بکەین وەك ئەوەی ئێستا لەهەرێمی کوردستان پەیرەوەی لێ دەکرێ لەسیستەمێکی پەروەردەیی بۆ وەدەستهێنانی ناو وشۆرەت، یاخود چەواشکردنی دنیا بەوەی ئێمەش میللەتێکی پێشکەوتووین وسیستەمی پەروەردەی ئەوروپی پەیڕەو دەکەین، بەبێ ڕەچاوکردنی باری سیاسی وکۆمەڵایەتی و ئابووری وسەرجەم بوارەکانی دیکەی خودی تاکەکانی گۆمەڵگە، لەوانە لایەنی دەروونی تاکی کورد.. لەو ڕێیەدا سامانی کوردستان بەخودو خۆڕایی لەگەرووی چەند هەلپەرستێك دەکرێ بۆ چەند دەستکەوتێکی کاتی پەروەردەیی، گەر بوو بێتی. لەکاتێکدا کەلتووری خۆشمان فەرامۆش وبێ بایەخ پشتگوێ خراوە، مەگەر وەك مێژوویەکی ووشکهەڵاتوو لەدوا - لاپەڕەکانی کتێبی کۆمەڵایەتی پرۆگرامی خوێندنی پێ پڕ کراوەتەوە، ڕەنگە ئەوەش ڕۆڵی پاراسیتۆڵێکی هێورکەرەوە ببینێت نەك پەروەردەو فێرکردن.. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا واشتێبگەین کە نەخشەو بەرنامەیەکی درێژخایەنی پەرودردەییمان

**زەمینەی وڵاتەکەمان لەبارەو گونجاوەو پڕپەتی لەخاوەن ئەقڵی پەروەردەیی داهێنەرانەو گڕوتینی وزەی شاراوەی زۆریان لایەو کەشکۆڵی زانیارین**

پەیرەو کردووەو وەك ئەزموونیش بەسوودە بۆ کوردستان. ئەو وەهمە وا دەکات ئێمە بەوەندە ئیکتیفا بکەین و هەر گیز بیر لەباشترو چاکتر نەکەینەوە، ئەو کاتە هەر چەند ساڵێکە جارێکیتر پەروەردە لە کوردستان تووشی ئیفلیج بوون دەبێتەوە. بۆیە لێرەدا ناچارم جارێکیتریش ڕوو لە شارەزایان وپسپۆڕانی پەروەردەیی بکەم وپێیان بڵێم کە زەمینەی وڵاتەکەمان لەبارەو گونجاوەو پڕپەتی لەخاوەن ئەقڵی پەروەردەیی داهێنەرانەو گڕوتینی وزەی شاراوەی زۆریان لایەو کەشکۆڵی زانیارین، با سوود لەو توحفە سەنگین ودەگمەنانە وەرگرین ورێگە نەدەین ئەو توانا وبەهرانە بپوکێنەوە. ئەوەش لەڕێگەی دانانی بنەمای پەروەریی دەبێت لەدروستکردنی کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی گشتگیرەوە کە پراکتیکیانە پەیڕەوی لەپرۆگرامی پەروەردەیی بکات، ڕەنگە ئەوە پێویستی بەکات بێت و زوو جێبەجێ نەکرێت، بەڵام دەستپێکی گەورەترین هەنگاوە لە بەرەو کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی لەکوردستان. ئەو کات لەڕێگەی ئەو کۆمەڵگە پەروەردەییەوە هەوڵبدرێت سەرنجی شارەزاو پسپۆڕانی بەهرەداری بەسەلیقەی پەروەردەیی جیهانی رابکێشن بۆ هەرێمی کوردستان لەپێناو پێگەیاندنی نەوەیەکی تەندروست وهوشیاری کوردو هاوردە کردنیان بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی وەك تاکێکی بەسوود. ئەمە بابەتێکە هەم گرنگە بۆ سروشتی پەروەردەو پەروەردەکاری لەکوردستاندا، هەم تەوەرێکە لەپرۆژەیەکی مەزن کە کوردستان بەرەو کۆمەڵگەیەکی پەروەردەیی هاوچەرخ دەبات.



# سۆزی دایباب و بنیاتنانی کەسایەتی منداڵ

**مامۆستا: شیرین عوسمان**

مەبەست لەسۆزی دایباب ئەو هەستە دەرونیەیە کە پەروەردگار بەدڵە گەورەکەیانی بەخشیوە بۆ دەربڕینی بەرامبەر بە منداڵەکانیان لەشێوەی خۆشەویستی و بەزەیی پێداهاتنەوەبۆ ئەوەی منداڵ لەسایەی ئەو هەستە جوانانەدا لەبارێکی دەرونی تەندروست شان بەشانی جەستەیەکی تەندروست ژیان بگوزەرێنێت و قۆناغەکانی ژیانی گەورەیی ببڕێت.وە دەربڕینی هەست و سۆزی خۆشەویستی بناغەیەکی پتەووهاوسەنگ بۆ کەسایەتی منداڵ دادەمەزرێنێت، چونکە منداڵ شان بە شانی خۆراك پێویستی بەخۆشەویستی هەیە.

دەبینین منداڵ لە قۆناغی کۆرپەلە لە سکی دایکی دا دەمارە وردیلەکانی بەنێودیواری ڕەحمی دایکیدا بڵاودەکاتەوە بۆ وەرگرتنی خۆراك هەروەك ڕوەك ڕەگەکانی بەناو خاك دا بڵاو دەبێتەوە بۆ هەمان مەبەست. دواتر پاش جیابوونەوەی منداڵ لەدایکی لەخۆراکدا سەربەخۆدەبێت بەڵام ئەم جارەیان تاکو مردن ڕەگەدەرونیەکانی پێویستیان بەوەرگرتنی خۆراکی دەرونی هەیە لەدەرونە گەورەکەی دایباب. دیارە سودی دەربڕینی سۆزو خۆشەویستی بۆ منداڵدووجەمسەرەو وەك تەزووی کارەبا بەناو بازنەی خێزاندا دەسوڕێتەوە. بۆنموونە لەلایەنی منداڵەوە بۆ پێگەیشتن پێویستی بە هاوسەنگی لایەنی ماددی و مەعنەوی هەیە، لێرەدا یەك لەو تاقیکردنەوانە دەخەینە ڕوو کەیەکێك لە سەنتەرەکانی توێژینەوەی زانستە مرۆییەکان ئەنجامی داوە. بۆ دەرخستنی ئەم ڕاستیە، تاقیکردنەوەکەیان بریتی بوو لە دوو کۆمەڵە منداڵ کەلەیەکێك لەباخچەکانی ساوایان ژیانیان بەسەر دەبرد، بۆ هەردوو کۆمەڵە هەمان پێدایستی مادی دابین کرا وەك خۆراك و پۆشاك و ئەوانی تر بەبێ هیچ جیاوازییەك بەڵام لەڕووی مەعنەوی کۆمەڵەی یەکەم بەشێوەیەکی ڕۆژانە باوەشی گەرمی دایبابیان دەبینی و سۆزو خۆشەویستیان ئاڵو گۆڕ دەکرد لەو کاتەدا کۆمەڵەی دووەم حەفتانە تەنها دوو جار ئەم دەرفەتەیان پێ دەدرا. سەرەنجام ئەم دوو کۆمەڵە منداڵە گەورەبوون و چوون بۆ قوتابخانە، تێبینی کرا کۆمەڵەی یەکەم کە بارودۆخێکی ماددی و مەعنەوی هاوسەنگی هەبوو ئاستی خوێندن و تواناکانی زۆر بەرزتر بوو بەبەراورد لەگەڵ کۆمەڵەی دووەم کە بارودۆخێکی لاسەنگی هەبوو. بەڵکو لەمەش ترسناکتر ئەوە بوو ڕێژەی مردن لەکۆمەڵەی دووەمدا زیاتر بوو. باری دەروونی شڵەژاو و کێشەی ئەندامی بۆ منداڵ دەنێتەوە وەك نووستنی قورس و میز کردنی شەوانەو پەرش و بڵاوبوونی سەرنجی منداڵ بۆ دەوروبەری. لە لایەنی دایبابانەوەش دەربڕینی ئەم سۆزو خۆشەویستی یە دەبێتە مایەی ئاسوودەکردنی دەرونیان و سووك کردنی بەرپرسیاریتی یەکەیان بەرامبەر منداڵەکانیان، کەلە جیاتی ماندووبون تام و چێژی نیعمەتی (منداڵ) بزانن، کە پەروەدگار پێ ی بەخشیون. وە ئەو دایبابانەی مامەڵەی خۆشەویستی لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن پرۆسەی پەروەردەکردنیان چالاکەو ئاسان بەڕێوەدەچێ.

گومان لەوەدا نییە خێزانی سەرکەوتوو لەم بوارەدا زۆرن بەڵکو تەزووی سۆزو خۆشەویستی هێزی شاراوەی سەرکەوتنیانە. بەڵام ئەوەی جێگەی داخە خەڵکی نەشارەزاش لەم خاڵە هەستیارەدا هەن و زانیاریان کەمە و ژیانی خێزانیان ئیفلیجە بۆ ئەم خێزانانە دەڵێین مرۆڤ تەنها یەك جار هەلی ژیانی پێ دەدرێت بۆ دیاری کردنی ئاستی بیرکردنەوەو هەڵس و کەوتی بۆیە ڕاگرتنی هاوسەنگی لە ژیانی خێزاندا ئەرکێکی سەرشانیانە بەرامبەر بە خواو بە میللەت بەنەوەی دوارۆژ، ئەویش بە فێربوون چونکە وەك دەڵێن ژیان هونەرە هونەریش فێربوونی دەوێت. بۆ ئەم مەبەستە ئەم چەند خاڵە دەخەینە ڕوو وەك یارمەتی:

چاوخشاندن بە پەیوەندی دەروونی نێوان ئەندامانی خێزان بۆ دیاریکردنی خاڵە لاوازەکان و چارەسەرکردنیان.

تەرخان کردنی کاتی تایبەت بۆ چالاکی خێزانی هەمەجۆرتر بۆ زیادکردنی ڕێژەی خۆشەویستی و نزیك بوونەوە لە یەك.

گوێ گرتن لە منداڵەکان بۆ دەربڕینی ڕەخنەکانیان چونکە ئەوان وەك گەورەکان سەرقاڵ نین و کامێرای مێشك و دڵیان ساف و ڕوونە.

دابەش کردنی ئەرکەکانی ناو خێزان بە شێوەیەکی هونەری تاوەکو هەر تاکێك هەست بە گرنگی بوونی خۆی بکات.

دایبابان دەبێ بزانن هەر ئەندامێك لە خێزان چ گەورە چ بچووك مافی ئەوەی هەیە خۆشەویستی وەرگرێ وکێشەکانی بەگوێرەی توانا بۆ چارەسەر بکرێت. بەم شێوەیە ژینگەیەکی تەندروست لەناو خێزاندا دێتە ئاراوە و منداڵ ئاسودە دەبێت و ئایندەی گەش دەبێت.



# نهێنیەکانی پەروەردە

نوسینی: هەمزە عەباس فەقێ



پەروەردە لەگەڵ ئەو کاریگەریە فراوانەی لەژیانی مرۆڤەکان دا لە خۆی دەگرێت، لەگەڵ کاریگەریە سەنگینەکانی بە هەردوو ئاراستەی ئاسۆیی و ستونی لەناو کۆمەڵگە، هاوکات بەهەردوو دیوی رابردوو داهاتو لە دواکەوتویی و پیشکەوتنی گەلاندا پشکی شێری هەیە، ئەمرۆ دوای ئەو هەموو پیشکەوتن و داهێنانە بەرزانەی مرۆڤ، پەروەردەو فێرکردن لەسەر شانۆی ژیان لەڕوانگەی هێزی کاریگەریەکانی خۆیەوە دەبینرێت، هەروەکو چۆن لەرابردودا یابانیەکان دوای کارەساتی هیرۆشیما گرنگی پەروەردەیان وەك دەروازەیەك بۆ رزگاری گەل و وڵات خستە بەرچاو، ئیتر ئەوان بە گرتنەبەری ئەو ڕێگەیە نەك هەر توانیان وڵاتیان سەر لەنوی دروست بکەنەوە، بەڵکو بەرێکەوتن رووەو چلەپۆپەی پیشکەوتن و دروست کردنی ژیارێکی درەوشاوە کە جێگەی شانازی خۆیان و نەوەکانی داهاتویان و گشت مرۆڤایەتیش بێت، هەر لەوێوە لە لوتکەوە نهینی سەرکەوتنی خۆیان بە گوێچکەی مرۆڤایەتیدا چرپاند، بە تایبەت گەلانی ژێردەستەو رزگاریخواز کەدەیانەوێ لە کۆت و زنجیری دواکەوتویی رزگاریان بێت و بگەن بەئامانجە باڵاکانیان، با گرنگی بدەن بە پەروەردەو فێرکردن با بودجەی وەزارەتی پەروەردە لە بودجەی گشت وەزارەتەکان زۆرتر بێت. وتیان نابی بەهیچ کلۆجی لە وەزارەت و نۆرگانەکانی پەروەردە بە قەد (مثقال ذرة) رۆتین و گەندەڵی هەبێ. بەڵکو هەموو بەرپرسان و کارمەندانی ئەو بوارە دەبێ کەسانی پسپۆڕو خاوەن توانابن، واتە کەسی شیاو لەشوێنی شیاو دابنین، دواجار وتیان کاروانی پەروەردە بەشێوەی گشگیر لەباخچەی ساوایانەوە دەست پێ دەکات بۆیە کەسانی خاوەن بڕوانامەی بەرز و پسپۆر لەوێ دابمەزرێنن، با تۆوی زانست و پەروەردە لێزانانە لەناخی نەوەکاندا بروێنن، تاوەکو باشترین زەمینە بڕەخسێت بۆ پێشکەش کردنی تاکێکی هۆشیار و زانست خواز بەکۆمەڵگە، پاشان قۆناغەکانی تری خوێندن، جێگەی داخە ئێمەی کورد نەمانتوانی لەقۆناغی رزگاری و دروست کردنی دەوڵەتداریماندا لەو پەیامانە تێبگەین!؟ کێشەو ململانێ سیاسیەکان لەسەر حسابی ئەم لایەنە هەستیارو بنچینەییە کەوتنەکارو ڕێگای گەیشتن بەئامانج بۆ سەرلەنوێ بونیاد نانەوەی کەسایەتی تێکشکاوی تاکی کوردی کە بۆ چەندین دەیە بوو لەسایەی پەروەردەیەکی سەقەت لەژێر نیری زاڵمان و دوژمنانی دا هەست و نەستی تێك شکابوو زۆر دورترکردەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی تر لەڕێگای رەخساندنی کەشێکی ئاڵۆزو پڕ لەتوندو تیژی هەلی گەڕانەوەی متمانە بەخۆبوون و لەسەر پێ وەستان لای تاکی ئێمە زۆر لاوازتر بوو. بۆیە ئەمەش نەك وای کردوە ئاستی زانست و پێشکەوتنمان ڕابگرێت بەڵکو کۆی پرۆسەی خوێندەواریمان بەپێی سەرەتاترین پێناسەکانی خویندەواری خستۆتە ژێر پرسیارەوە!!؟ تەنانەت بویتین بە پێشەنگێکی ناتەندروست لەناوچەکە، تائەو ئەندازەی چەندین نوکتەی واقعی لەرەوشی خوێندنماندا دروست بووە، پۆلی شەشەمی بنەڕەتیەو خوێندەواری نیە!! زانکۆ تەواو دەکات بەشی زمان کەچی نەك هەرهیچ زمانیکی تر فێر نەبووە! تەنانەت کێشەی لە زمانی دایکیشدا هەیە!؟ (ع.ح) لێك جوداناکاتەوە!!؟ قوتابی دکتۆرایە لە شەریعەو نازانێ قورئان بخوینێ!! جێی خۆیەتی ئەو دیاردانەو چەندانی تر هەستی بەرپرسیاریتی هەموو پەروەردەکاران و بەتایبەت بەرپرسیاران لەکەرتی پەروەردە رابچڵەکێنێ و هەوڵ بدەین هێزو توانا پەرش و بڵاوەکانمان یەك بخەین و چاکسازی بنچینەیی لەو کەرتە هەستیارەدا دەست پێبکەین، بەجۆرێك پرۆگرامەکانی پەروەردەو فێرکردنمان دابڕێژینەوە کە ببنە وەڵامگۆی پرسیارە هەنووکەییەکانی قوتابیان و فێرخوازان و نەخشەڕێگا بۆ داهاتوی زانست و پێشکەوتنی گەل و وڵاتمان.

# با لەوانەوە فێری ژیـــان بیـــن

**نوسینی: د.ریدار محمد ئەمین**

زۆربەمان ئەگەر نەڵێین هەموومان، دادو بێدادمانە لەو جەنجاڵیەی ژیانی ئەمڕۆ، تەکنەلۆژیا هەموو شتێکی بۆ فەراهەم کردوین، دەتوانین لە شوێنی خۆمان دابنیشین و قسە لەگەڵ هەموو جیهان بکەین، یان لە ڕێگەی سەتەلایت و ئینتەرنێت و هەموو جیهان سەیر بکەین، کامە دۆست یان خۆشەویست، بەهەزاران کیلۆمەتر لێمان دوورە، بە یەك چرکە لەگەڵی بدوێین و بیبینین، کەچی هەر دادو بێدادمانە!

ئێمە وا هەست دەکەین تەکنەلۆژیا هەر بەخۆڕایی ئەم هەموو ئاسانکاریەی پێ نەبەخشیوین، بەڵکو لە بەرامبەردا دوو بەبەهاترین سەرمایەی ژیانی لێ سەندوینەتەوە، یەکەمیان ئاسودەیی و بەختیاری دڵ و دەرون و دوەمیشیان تەندروستیە.

ئەوەی دەمەوێ لێرەدا باسی بکەم چیرۆکی ئەو پیرە دکتۆرەیە کەوا لەدەست سیخناخی و بێڕەحمی شار بێزار دەبێت و دووبارە دەگەڕێتەوە زێدی باب و باپیرانی مرۆڤ کە (سروشتی ڕەنگین و چڕی دارستانە).

دکتۆر بێسکی پزیشکێکی پسپۆڕی نەشتەرگەریە. ئەم دکتۆرە تەمەنی ٦٧ساڵ بوو بڕیاری دا ژیان بباتەوە بۆ نێو باوەشی پڕ لە بۆن و بەرامی سروشت و کۆتا ڕۆژەکانی تەمەن لەوێ بگوزەرێنێ.

دکتۆر دەڵێ: بیست ساڵ لەمەوبەر توشی نەخۆشی (پرۆستات و پێست و هەوکردنی درێژخایەنی بۆڕیەکانی هەناسە) بووم ماوەیەکی زۆر بەدەم ئەو دەردانەوە ئازار دەکێشێ و بەمەبەستی چارەسەر ڕێگای چەندین وڵات دەگرێتەبەر، ئەمریکا، یابان، وڵاتانی ئەورووپا، بەڵام بێ هودە دەبێت، تا تەواو وەڕس و بێزار دەبێت.

ڕۆژێك لەخۆی دەپرسێت، باشە من چیم؟؟! یان نەخۆشم یان نەخۆش دەبینم! لەم جەنجاڵیەی ژیانیش دەرفەتێکم نییە



بۆ خۆم پشوییەك بدەم.

لەم ساتەوە زۆر لە ژیان بێزار دەبێت و وا هەست دەكات ژیان بەم شێوەیە بەردەوام نابێت، بۆیە ڕۆژێك دەچێتە سەر كێوێكی بەرزو پڕبەدەنگی هاوار دەكات:

«خودایە فریاد ڕەسم بە»

پاشان دێتە خوارەوەو بڕیار دەدات لەم قەرەباڵغیەی شار بچێتە دەرەوە، بۆیە لەپاڵ كێوێكی بەرز دوو هێكتار زەوی دەكڕێت، كە هەمووی دارودڕە، دور لەشار و جەنجاڵیەكانی بناری ئەو كێوە دەكاتە ماڵی خۆی، كێڵگەیەك بۆ بەخێو كردنی هەنگ و یەكێكیش بۆ بەخێو كردنی مانگا دروست دەكات، جگە لە باخێك كە پڕی دەكات لە چەندین میوەی خۆش و باخچەیەكیش بە گوڵی جوان دەرازێنێتەوە.

بەكورتی شێوە بەهەشتێك دروست دەكات، دور لە هات و هاوارو بێڕەحمی و سەرخۆشی شار، ئاوو هەوای سازگار دەنۆشێت.

ئەم دكتورە سێ ساڵ بەر لەدروست كردنی ئەم كێڵگەیە چاوەكانی ئاوی سپی هەبووە، ئێستاكە نەك هەر ئاوی سپی نەماوە، بەڵكو لە هەموو نەخۆشیەكانی تریش كە پێشتر باسمان كرد چاك بۆتەوە، خواردنی ڕۆژانەی ئەم دكتۆرە سەوزەو میوەی نوێ و شیری تازەو پانزە پەرداخ ئاوە، بەم دواییەش نەخۆشخانەیەكی بچوكی لە ماڵەكەی دروست كردوەو نەشتەرگەری تێدا ئەنجام دەدات.

ئەو دەڵێت هەموو كوڕو كچەكانی بە چەند دەردێكەوە دەناڵێنن و خۆشی تەندروستی زۆر باشە، هۆیەكەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە ئەو ڕۆژانە ئاوی سازگارو هەوای پڕلە ئۆكسجین و میوەی نوێ دەخوات، كەچی ئەوان خواردنەوەی وەك بیبسی كۆلا دەخۆنەوەو دوكەڵی پیسی شار هەڵدەمژن و سەوزەو میوەی بە مادەی كیمیاوی چاككراوو خواردنی قوتوبەند دەخۆن!

تاقە خەفەتی ئەو پیرە پیاوە ئەوەیە كە چۆن مرۆڤ نایەوێت سود لە سروشت ببینێت و هەردەم هەوڵی تێكدانی دەدات تا ئێستا خودی خۆی نزیكەی (١٠٠٠٠) درەختی چاندوە!

چیرۆكی ئەم دكتۆرە پیرە ئەمەمان نیشان دەدات كەوا ژیان تەنها بریتی نییە لە كۆكردنەوەی پارە وسامان، چونكە ئەم بۆچوونە دوو گەورەترین كارەسات دروست دەكات، ئەوانیش لە دەست دانی بەختەوەری و تەندروستیە! بەداخەوە لەوڵاتی ئێمە هەموو ماناكانی ژیان لە كۆكردنەوەی سامان كۆبۆتەوە، هەموو پێوەرەكانیش بە پێوەری سامان دەپێورێن، بۆیە هەندێك لە مرۆڤە هەژارەكان هەموو ژیانیان بۆ ئەوە تەرخان دەكەن كە پارەداربن و لەم پێناوەش هەموو شتێك لە دەست دەدەن، دەوڵەمەندیش هەموو ژیانی بۆ ئەوە تەرخان دەكات كە پولەكەی زیاتر بێت.... هیچیان



## تەكنەلۆژیا هەر بەخۆڕایی ئەم هەموو ئاسانكاریەی پێ نەبەخشیوین، بەڵكو لە بەرامبەردا دوو بە بەها ترین سەرمایەی ژیانی لێ سەندوینەتەوە

لە مانا ڕاستەقینەكەی ژیان تێناگەن، لە وڵاتان ژیان ئەو ساتەیە، كە تێیدا دەژیت، لای ئێمەش ژیان ئەو ساتەیە كە دواڕۆژ بۆ كوڕو ئەوەو ئەوەی دوای ئەو دابین بكەین، ئەوان دەزانن كە ژیان كورتەو كۆتایی دێت، ئێمەش پێمان وایە هەزار ساڵ دەژین، بۆیە دەبینین لەسەر ڕوبەری چەند سەد مەتر دووجا خانویەك لە دووسێ نهۆم و چەند ژووری بەتاڵ و زیادەوە دروست دەكرێت، یان باخچەی نییە، یان تەنها دوو مەتر دوجایە،كەچی لە ژێرەوە گەراجێكی هەیە جێگای چەند ئوتومبیلی لێدەبێتەوە! سەرەڕای ئەوەش ئەوەندە ڕقمان لە ئۆكسجین و دارو درەختە، هەر باخچە تێك دەدەین و لە شوێنی ئەو ژوور دروست دەكەین! حكومەتیش درێغی ناكات لە هاریكاریكردنمان و ڕۆژانە دارودرەختی شونە گشتیەكان بە بیانوی جیا جیا دەبڕێتەوە! چیرۆكی ئەو پیرە پیاوە پێمان دەڵێت. بەختەوەری بە پلەو پایەو سامان نییە بەڵكو بە تێگەیشتنە لە ژیان.

# چی بکەین بۆ ئەوەی منداڵەکانمان کتێب و خوێندنەوەیان خۆش بوێ؟

**نوسینی: روشنا رشید**

منداڵان جیاوازن لە حەزو ئارەزووەکانیان، هەندێ منداڵ خۆیان بەشێوەیەکی سروشتی حەز بە خوێندنەوە دەکەن و خوێندنەوە بەشێکە لە خولیاکانیان، بەڵام هەندێ منداڵ بەلایانەوە گرنگ نی یە ئەگەر لە ژیانیان کتێبێکیان هەبێت یان نا.

بەڵام ئەوەی گرنگە دایك و باوکان ئەبێ ئەمە بزانن کە پێویستە خوێندنەوە بکەن بەبەشێك لە حەزو ئارەزووی منداڵەکانیان. ئەبێت وا لە منداڵەکانیان بکەن لەگەڵ کتێب هاورێ بن و خۆشیان بوێ.

***هۆی چی یە هەندێ منداڵ حەز بە خوێندنەوە ناکەن؟**

- خوێندنەوە بێزارکەرە.
- خوێندنەوە کاتێکی زۆرمان لێ ئەگرێ و کاتی یاریکردنمان نابێت.
- خوێندنەوە واتە ئاقڵ دانیشتن.
- خوێندنەوە هەمووی ئامۆژکاریە، کتێبەکان دەڵێن نابێت هیچ بکەین.
- کتێبەکان درێژن.

*** هۆی چی یە هەندێ منداڵ کتێبیان خۆش دەوێ و حەز بە خوێندنەوە دەکەن؟**

- خوێندنەوە دڵخۆشکەرە.
- خوێندنەوە بەرەو ڕێگەی ژیریمان دەبات.
- خوێندنەوە هاوکاریمان دەکات بۆ ئەوەی داهێنەر بین.
- خوێندنەوە ئاشنامان دەکات بەشوێنی جیاوازو شێوازی ژیانی جیاواز لە جیهاندا.
- خوێندنەوە فێری زۆرترین ووشەمان دەکات، زمانم پاراو ئەکات.

*** خوێنەری چاک لەکوێ دروست دەبێت؟**

خۆشەویستی منداڵ بۆ کتێب و خوێندنەوە لە ماڵ دروست ئەبێت لەلایەن دایك باوکیانەوە، زۆربەی دایك وباوکان پێیان وایە کە مامۆستا بەرپرسیارە لە دروست کردنی ئەو جۆرە خۆشەویستی یە لای منداڵ، بەڵام مامۆستا ناتوانێ وەك دایك و باوك خۆشەویستی بۆ کتێب لای منداڵ دروست بکات. چونکە منداڵ سودەکانی ئەو چیرۆکانەی لەیاد ئەمێنێت کە دایك و باوکە لەکاتی خەوتن بۆی دەگێڕنەوە وئەو کاتانەی کە لە گەڵ هاورێو خوشك و براکانی لە ماڵ دادەنیشێ ئەخوێنێتەوە و کتێب ئەگۆڕێتەوە لە زەینی منداڵ دەمێنێتەوە لە هەموش گرینگتر ئەو ئازادیەیە کە لە لایەن دایکو باوکیەوە لە ماڵ پێی ئەدرێ بۆ خوێندنەوە هەر شتێك کە خۆی حەزی پێ ئەکات، لەگەڵ ئەوەش هاندەدرێت بۆ خوێندنەوەی

هەمو ئەمانە هۆکارن بۆ ئەوەی خوێنەری باش لە ماڵ دروست ببێت کە لە قوتابخانە. منداڵان جیاوازن لە یەکتر بۆیە دەبێت ڕێگای هەوڵدانیش لەگەڵیاندا جیاواز بێت ئەو ڕێگایەی کە لەگەڵ منداڵێك ئاشنا دەکرێت ڕەنگە منداڵێکی تر سوودی لێ وەرنەگرێت. بۆیە پێویستە دایکو باوکان منداڵەکەیان بناسن. ناسینی کەسایەتی منداڵەکەت باشترین ڕێگات پیشان دەدات بۆ ڕاهێنانی لەسەر خوێندنەوە. هەمومان ئەبێ ئەوە بزانین هەریەکە پرۆسەکانی خوێندنەوە و نوسین ئەبێت بە وازی دیاری کردن ئەنجام بدرێت لەگەڵ منداڵ. کاتێ کەسایەتی منداڵەکەت زانی و ئاشنابووی بە ئارەزووەکانی ئەو کاتە دەتوانی باشترین ستراتیژی هەڵبژێری بۆ ئەوەی بیکەی بە هاوڕێی کتێب و وای لێ بکەی بە درێژایی تەمەنی خوێندنەوەی خۆش بوێت. کە ئەوەش بە بەهاترین خەڵات کە لە هەمو ژیانت پێشکەشی منداڵەکەتی دەکەیت.



## (٣-٥)ساڵان تەمەنی(سەرسوڕمان)

ئەم تەمەنە ناو دەنرێت تەمەنی سەرسورمان، چونکە لەو تەمەنەدا مناڵەکان هەمیشە لە شتەکان ورد دەبنەوەو سەریان دەسوڕمێ،بۆیە ئەو قۆناغە قۆناغێکە گونجاوە بۆ ئەوەی منداڵەکەت ئاشنا بکەی بە چیرۆك، ئەوانیش لەو تەمەنەدا لە ئامادە باشی دان بۆ گوێگرتنو وردبوونەوە. ئەبێت لەو تەمەنەدا منداڵەکانمان ممارەسەی نوسین دەست پێ بکەین لە ڕێگەی وێنەکێشان زۆر گرینگە لەم تەمەنە ڕێگا بە منداڵ بدرێت هەرشتێك حەزی لێبوو بیکات لەگەڵ ئەو کتێبەی داومانەتە دەستی. گرینگ نیە دەدڕێنێ، پیسی دەکات، ڕەنگی دەکات، ئەوەی گرینگە کتێبەکەی لە دەست بێت. ئینجا قۆناغی خوێندنەوەی دوای ئەوە دەست پێدەکات.

هەوڵ دە لەم قۆناغەدا سندوقێك پڕ بکەی لە کتێب و شتە بچوکەکان و یاری منداڵانی جۆراوجۆر کە دەنگی جۆراوجۆر وەرە کەن، ئینجا لیستێکی ناوی دروست بکەو هاوکاری منداڵەکەت بکە کە خەت بە سەر ناوی ئەو شتانە بکێشێ کە لە نێو سندوقەکە داتناوە. هەروەها ئەوشتانەی کە ناسراون لە دەوروبەری مناڵەکەت ناویان بە پێنوسی ڕەنگاوڕەنگ بنووسە هاوکاری مناڵەکەت بکە لە ناسینەوەی پیتەکان قۆناغ بە قۆناغ.

## (٦-٨)ساڵان تەمەنی (دۆزینەوەو دەرخستن)

ئەم تەمەنە زۆر گرینگە چونکە منداڵ خۆی دەست دەکات بە خوێندنەوەو فێرئەبێت بخوێنێتەوە ئەوە قۆناغی دۆزینەوەیە، منداڵ خۆی شتەکان لە کتێب ئەدۆزێتەوە، بۆیە پێویستە دڵنیا بیت کە ئایا ئەو کتێبەی ئەو منداڵە ئەی خوێنێتەوە شیاوە بۆ تەمەنی ئەو؟ هاندان لەم تەمەنە زۆر گرینگە بۆیە هانی منداڵەکەت بدە. هاوکاری منداڵەکەت بدە شێوازی هەڵبژاردنی کتێب بگۆڕێت ئەم قۆناغە قۆناغی گواستنەوەیە کە کتێبە وێنە بۆ کتێبی نوسینو[بەش بەش]بەڵام هەندێ منداڵ بەردەوام ئەبن لە سەیرکردنی کتێبی پڕ وێنە، ئەمەش کارێکی ئاسایەو ڕێگریان لێ مەکەن.

## چی پێویستە بکرێت لە تەمەنی (٦-٨) ساڵان؟

وەك باسمان کرد، کاتێ کەسایەتی منداڵەکەت ناسیو شارەزای حەزو ئارەزووەکانی بوویت، ئەوا لەو قۆناغەدا کتێبێك هەڵبژێرە کە ئەو دڵنیاییە لە خۆ

ئەگرێت کە منداڵەت هەیەتی بۆ ئەوەی پیشانی منداڵەکت بدەیت کە کتێب ئەو هاوڕێیە هەمیشە ڕێنمایمان دەکات بۆ ئەوەی زیاتر دەربارەی حەزو خولیاکانمان بزانین، زیاتر فێربینو زیاتر چێژ لە خولیاکانمان وەرگرین، منداڵ لەو تەمەنەدا چیرۆك لە مێشکیاندا دروست ئەکەن. بۆیە ڕێگایان بدەن چیرۆکەکان بڵێن تۆش بۆیان بنوسنەوە، یان گەر دەتوانن با خۆیان بنوسن.

ڕێگا بەمنداڵ بدە لەو تەمەنەدا کە لیستی پێداویستیەکانت لەگەڵ بنوسێ، کاتێك ئەتەوێ بچیت بۆ بازاڕ داوای لێبکە کتێبی وێنە بۆ خوشك و برا بچوکەکانی بخوێنێتەوە چونکە وەك وتمان ئەو تەمەنە تەمەنی دروست کردنی چیرۆکە لە وێنەکان چیرۆك دروست ئەکات بۆیە هاوکاری بکە چیرۆکە دروستکراوەکان بگێڕێتەوە، زۆر بخوێنەوە بۆیان و داوایان لێبکە زۆر بخوێننەوە بۆت.

## (۹-۱۰) ساڵ تەمەنی سەرکێشی

ئەم تەمەنە جیاواز ترە لە تەمەنەکانی تر. منداڵ لەم تەمەنە لە نێوان زنجیرەیەك کتێبی خەیاڵیدایە، خەیاڵ و نادیاری دەبن بە بەشێك لە ژیانی بۆیە خوێندنەوە بە ئاسانی ئەتوانێ فشار بخاتە سەر خشتەی خوێندنی و بە بۆنەی خوێندنی قوتابخانە خوێندنی پەرتوکی گشتی فەرامۆش دەکەن، بۆیە پێویستە ئاگادار بین.

## چی پێویستە بکرێت لەم تەمەنەدا؟

یارمەتی منداڵە کەت بدە نوسینەکانی لە گۆڤاری منداڵان بڵاو بکاتەوە بیخە گروپێکی منداڵان و پەرە بە چالاکیەکانی بدە، خۆت و هەموو خزمەکان هان بدە کتابی بۆ بکەن بە خەڵات، زوو زوو لە گەڵی دابنیشە وەکونەوەی لێدوانی ڕۆژنامەوانیتان هەیە،وەکو نوسەر هەڵسوکەوتی لە گەڵ بکە، بەیەکەوە چیرۆکی کۆمیدیا بنوسن چیرۆکی ئاهەنگەکان بنوسن، بۆی کۆپی بکەو بەسەر هاوڕێیانی ببەخشەوە.

## تەمەنی (۱۱-۱۳)ساڵ

ئەوە ئەو تەمەنەیە کە زۆر بەی منال بێزار ئەبن لە کتێبی منالان. بە دوای هاوڕێدا دەگەڕێن، گرنگی بە پەیوەندیە کۆمەڵایە تیەکان دەدەن. بۆیە دەبێت بەرنامەی تۆکمەی بۆ داڕێژین، بۆ خوێندنەوەی کتێبی دەرەکی جگە لە ئەرکی قوتابخانە.

## چی پێویستە بکرێت بۆ ئەم تەمەنە؟

دەبێت لەم تەمەنەدا بەشێوەیەکی هەستیارهەڵسو کەوتی لە گەڵ بکرێت بۆ نمونە کۆڕێکی بۆ ببەستە کەتەنها ئەو کەسانە داوەت بکە کە ئەو خۆشی ئەوێن و حەز دەکات لە گەڵیان بێت،ئینجا داوای لێ بکە کتێب بخوێنێتەوە، یان بەیەکەوە سەیری فیلم بکەن،وای لێبکە وا هەست بکات تۆ وەك نوسەرێکی گەورە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەی. بیکە ئەندام لە کتێبخانەیەك و با بەژداری چالاکیەکانی قوتابخانە بکات و نوسینەکانی بڵاو بکاتەوە، ئینجا کەسەیری فیلم دەکەن. داوای لێبکە لەگەڵ هاوڕێکانی باسی لەیەك چوون و جیاوازیەکان بکەن، لە نێوان خوێندنەوەی کتێب و سەیر کردنی فیلم.

## بیرت نەچێت!!

-بەشێك بۆ منالەکەت دیاری بکە لە کتێبخانە(ڕۆژانە،هەفتانە،مانگانە)کتێبی تازەی بۆ بێنە.

-زۆرترین پارەی بۆ بدە بە کتێب نەك بە سی دی.

-باڵە نێو ئوتومبێلەکەت کتێب و ڕۆژنامە هەبێت، لە کاتی شۆفێریدا داوای لێبکە لە جیاتی ڕادیۆ بۆت بخوێنێتەوە.

-ئامادەییت هەبێت لە کۆ بوونەوەی دایباب لە قوتابخانە. هەمیشە چاودێری پەیوەندی نێوان منداڵەکەت و مامۆستاو قوتابیەکان بکە.

-بامناڵەکەت بزانێت تۆ لەماڵ هەمان گرنگی دەدەی بە [بەشی خوێندنەوە]لە ژوری دانیشتن.

-خۆت زۆر بخوێنەوەچەندە سودی بۆ تۆ هەیە، ئەوەندەش بۆ ئەو. چونکە لاساییت ئەکاتەوە.

-وەڵامی پرسیارەکانی منداڵەکەت بدەرەوە و خۆشت پرسیاری لێ بکە.

-لە کاتی خوێندنەوەی کتێب و بابەت داوای پوختەی لێ بکە [بەکورتی پێی بڵێ دەربارەی چی بوو].

## سەرچاوەکان:


Resources Available to Parents Sesame Street magazine (age2-6) Ranger Rice (age3-8) zoo books (age4-12)Sports illustrad for kids (7-15) national geographic world (ages8-13) penny powe (ages8-14) 3-2-1 cantaet (age8-14)

-Ag ways to get kids to loue reading basketball digest cricket Disney aduantures highlights for chibleven humpty dumpty jaek and Lill stone soup turtle kid City.



# ئەمڕۆی پەروەردە



پرۆفیسۆری یاریدەدەر. د.عوسمان ئەمین

پەروەردە ڕۆڵێكی باڵای هەیە لە ژیانی ئادەمیزاد، هەر لە ڕۆژی لە دایك بوونیەوە تا دوا هەناسەی لە ژیان، چونكە ژیان ڕۆژانە لە هەموو بوارەكانیدا لە نوێبوونەوەو گۆڕاندایە، بۆیە دەبێت هەموو كەسێك ئامادەبێت بۆ سوود وەرگرتن لە هەموو زانیاریەكانی ژیانی خۆی و ژیانی خەڵك تاكو بەو ئەزموونانەی كە دێنە سەر ڕێگای لە ژیانی ڕۆژانە سود مەند بێت،بەم شێوەیە دەتوانێت ببێت بە ئادەمیزادێكی سەر كەوتوو لە ژیانی تایبەتی خۆیدا.

تاكو ئێستاش ئەو وڵاتانەی هەنگاوی زۆر مەزنیان ناوە لە بواری پەروەردە لە ڕێگای بەكارهێنانی تەكنەلۆجیا، زانیاری و زانستی دەروونناسی و كۆمەڵناسی،ساڵانە بەدواداچون دەكەن تاكو بزانن ئەم هەنگاوانە سودی بە كۆمەڵگای خۆیان بەخشیوە یان كەم و كوری هەیە بۆ چارەسەر كردنی ڕێگای زانستی تر دەگرنە بەر، تاكو ڕۆڵەكانیان بتوانن ڕۆڵی بەرپرس ببینن لەدواڕۆژیان،وەك ئەندامێكی كارا بۆ خزمەت كردنی گەل و نیشتمان.

ئەگەر چاوێك بەپەروەردەی خۆمان بخشێنین لە هەرێمی كوردستان، دەبینین پێویستی بە كاتێكی زۆر هەیە بۆ ئەوەی نەوەیەك دروست بكەین ببێت بە خەمخۆری میللەت، بەڵكو ئێستا نەوەیەك پێدەگەیەنین، تەنها خەم لە بەرژەوەندی خودی خۆی دەخوات، ئەوەی بیری لێ نەكاتەوە تەنها خاك و نیشتمانە، لەبەر ئەوە زۆر سكاڵامان هەیە لە نەوەی ئەمڕۆ كە بە بیرو باوەڕێك هاتۆتە مەیدانی كاركردن، زیانێكی زۆر دەگەیەنن بە دواڕۆژی نیشتمانەكەمان. ئەمڕۆ لەهەمووكات زیاتر پێویستی بەنەوەیەكی گیان فیداو خۆبەخش هەیە، كەبەرژەوەندی گشتی كۆمەڵگا بخاتە پێش بەرژەوەندیە كەسیەكانی خۆی.

قۆناغەكانی پەروەردە یەكەم هەنگاو لە پەروەردەی خێزانەوە دەست پێدەكات، كەبە قوتابخانەی ماڵ دەناسرێت و مامۆستاكانی دایك و باوك و ئەندامانی خێزانن،زانایان زۆر گرنگی بە شەش ساڵی یەكەمی تەمەنی مرۆڤ دەدەن لە بواری پەروەردەو فێربوون و كاریگەریە ئەرێنیەكانی،ئەگەر دایك و باوك لەناو خێزان ڕاست گۆ نەبن لە قسە كردن و مامەڵەیان لە گەڵ خەڵكانی تر، دەبێت منداڵەكانیان چ ڕێگایەكی تر بگرنەبەر لە ژیانی خۆیان؟؟

دووەم لایەنی كاریگەر لە پەروەردەدا دوای خێزان كۆمەڵگەیە،واتە پەروەردەی شەقام و كۆڵان،ئاشكرایە لە كۆمەڵگەی ئێمە دا ئەم بوارە بەتەواوی فەرامۆش كراوە،خزێنراوە لە ڕێگە ڕاستەقینەكەی،ئەمڕۆ شەقام ڕۆڵ و بەرپرسیارێتیە پەروەردەییەكەی خۆی لە دەست داوە،كەس خۆی بەبەرپرس نازانێت ئەگەر دیاردەیەكی ناشارستانی و ناتەندروستی بینی لە كۆڵانەكەی یان شەقام، واتە پەروەردەی شەقام ئێستا پەروەردەیەكی بێ سەرپەرشت و فەرامۆش كراوە.

لایەن و دەزگای سێیەم لە مەیدانی پەروەردەدا قوتابخانەیە،كە سەرەڕای ڕۆڵە گرنگ و كاریگەرەكەی پەروەردە، ڕۆڵی فێربوونیشی لە ئەستۆ دایە، جێگەی داخە كە ئەویش ئێستا ناتوانێت وەك پێویستە بە ئەرك و ڕۆڵی خۆی هەڵبستێت،كاریگەریە ئەرێنیەكانی ئەم ڕۆڵ نەبینینەش،



بۆتە دیاردەیەکی ترسناکی زانستی و کۆمەڵایەتی ئەوتۆ کە خەریکە کاریکاتە سەر شکۆی وڵات و ببێتە کێشەی تاك تاکی کۆمەڵگەکەمان، بێگومان ئەمەش کۆمەڵێك هۆکاری خودی و بابەتی لە خۆ گرتوە، وەك نەبونی بینای پێویست، قەرەباڵغی پۆل،نەبوونی هۆکارەکانی فێرکردن،نەڕەخساندنی ژینگەی لەبارو تەندروست بۆ قوتابی،لەسەروی هەموویانەشەوە کێشەی مامۆستا، هەر لە ڕێك نەخستنی میلاك تا نەبونی سەرچاوەو خول و گەشتی زانستی، بەڵام ئەوەی کە جێگەی ڕەخنەیە مامەڵەی مامۆستایە لە گەڵ ڕەوشەکە، کە نایەوێ پێشەنگ بێت بۆ قوتابیان، بەڵکو ڕۆڵی خۆی دەبینێ لە پێدانی ئەو زانیاریانەی کە لە پڕۆگرامی خوێندن بۆی دەست نیشان کراوە،ئەم حاڵەتە بۆ شایەکی نەشیاوە لە ژیانی تاکی کۆمەڵگە، دەبێ قوتابخانە کانگەی پەروەردەو فێربوون بێت ڕۆڵی سەرەکی ببینێت لە چاندنی بەرزترین ڕەوشت لە ناخی ئەم نەوەیە کە دەبێتە خاوەنی سبەینەو داوڕۆژی ئەم نیشتمانە.

دوالایەن کە لێرەدا ئاماژەی پێدەکەم لە ڕوی کاریگەریەوە بەسەر بواری پەروەردەدا،ڕاگەیاندن و دەزگا جۆربەجۆرەکانیەتی، بە هەرسێ لایەنی بسراو، بینراو،نوسراو،ئەمەش دەوەستێتەوە سەر ئەو عەقڵەی لە پشتی ئەو دەزگایانەوە هەیە، بەو ئەندازەی ئەگەر عەقڵێکی بونیاد نەرو دوور بین بێت، بەرژەوندی بەرتەسکی کەسی خۆی بخاتە دوای بەرژەوندیە بەرزو باڵا گشتیەکانی گەلەکەی، ئەوابێگومان ڕۆڵی ئەو دەزگایانە ئەرێنی و کاریگەرو دەرو شاوە دەبێت. بەڵام لە کاتی پێچەوانە بونی دا بەرئەنجامەکەشی پێچەوانە دەبێت، هەروەك لەم سەردەمەدا ئەم حاڵەتی پێچەوانەیە زۆرتر دەبینین!بەتایبەتتر کەناڵە ئاسمانیەکان، کە لە کوردستان تەنها چەند کەناڵێك نەبێت، ئەوانی تر ڕۆڵی زۆر نەرێنی و ناپەروەردەیی دەبینن، هەر لە دۆبلاژ و گواستنەوەی نەریت و کەلتوری بەسەرچوی وڵاتانی ئەوروپاو دوورو بەر کە هەموی لەسەر حیسابی سڕینەوەی بنەماو بەها بەرزە نەتەوەییە باڵاکانمانن.

سەرەنجام دەبێت لایەن و دەزگاکانی بەرپرس لە کەرتی پەروەردە و فێرکردن ڕۆڵی سەرەکی خۆیان ببینن، لە پێناو دروست بونی نەوەیکی پەروەردە کراو بۆ خزمەت بە گەل و نیشتمان

# خۆزگەی قوتابی

**نوسینی : رامیارکۆیی**

سڵاو مامۆستاکەم،

من دڵنیام تۆ ئێمەی قوتابیت خۆش دەوێ. بۆیە وا شاگولی نیو بەهاری تەمەنت دڵسۆزانە بەسەرماندا دەوەرێنی، تۆ جگە لەوەی زانستمان پێ دەبەخشی کەسایەتیشت نمونەیەکی زیندوە لە بەر زومی چاوەکانمان بۆیە ئەو کاتەی خوانەخواستە وەك فەرمانبەرێك ڕەفتار بکەی. ئیتر ئێمە کێ بکەین بە پێشەنگ؟!

کردارو گفتارەکانت لە نمایشێکی چل خولەکیدا، دونیایەك لە ڕەوشت لە یادگاری و ئەزمونیی ژیانمان پێدەبەخشێ، ئێمە دەزانین تۆش وەك هەر تاکێکی تری ئەم وڵاتە بێ بەش نیت لە نەهامەتیەکانی ژیان. بەڵام هیوا خوازین [illegible] خۆزگە [illegible] لە [illegible] زانست خوازو داهێنەر لە ناو حەرەمی قوتابخانە ئازارەکانت لە بیر ببەنەوە. بەڵکو [illegible] زەردەخەنە [illegible] [illegible] لە [illegible]

[illegible]

[illegible]ەکانی ژیان لە سایەی پێشکەوتنە ماددیەکان و داخوازیە زۆرەکانی بۆتنە دێوەزمەو خەندەی دایەو بابەیان لێ ستاندووین، لە چوار دەورمان [illegible] شکۆی ژیان دەبینین، [illegible] تا ئێمە لە کەناریدا بۆ ئاسۆیەکی گەش بڕوانین، هەر کە هاتیە پۆل خەندە بارانمان [illegible] خەندەبەخش [illegible]



# مامۆستای سەرکەوتوو

ئا: ژیار



لە ڕاستیدا پەروەردە پرۆسەیەکی ئاڵۆز و قورسە بۆیە خەڵکێکی زۆر بە هەڵە لە چەمکی پەروەردە تێگەیشتوون (پەروەردە –التربیە) زۆر جیاوازە لە (چاودێری کردن –الرعایە). مامۆستای سەرکەوتوو دەبێ لەسەر هەردوو پرۆسە کاربکات چونکە وانە ووتنەوە پێش ئەوەی (زانست) بێ (هونەرە) زۆر مامۆستای زیرەك هەیە بەڵام قوتابیان گلەیی زۆریان لێ ی هەیە دەڵێن «ڕاستە بۆ خۆی زۆر زیرەکە بەڵام ئێمە هیچ تێی ناگەین». ئایا دەبێ هۆیەکەی چی بێت؟

بێ گومان پرۆسەی وانە ووتنەوە لە سێگۆشەیەك پێك دێت (مامۆستا – پرۆگرام– قوتابی) ئەگەر مامۆستا بیەوێت ببێتە مامۆستایەکی سەرکەوتوو یەکەم هەنگاو دەبێ خۆی (خۆشەویست) بکات لەلایەن قوتابیان، میکانیزمی ئەم خۆش ویستنە گەلێ زۆرن لەوانە ئەزبەر کردنی ناوەکانیان و وەڵام دانەوەی پرسیارەکانیان و بانگ کردنیان بە کاك یان پەپولە خان بۆکچان ڕاستگۆیانە ببێتە ڕێنیشاندەریان خەمخۆری گیرو گرفتەکانیان بێ چ لەماڵەوە یان لە قوتابخانە بەم شێوەیە متمانەی بۆ دروست دەبێ و تۆی خۆش دەوێ و لەم ڕێگەیەشەوە بابەتەکەی تۆشی خۆش دەوێ. ڕۆژانە ئامادەی دەکات و بەم شێوەیە پرۆسەکە بۆتۆو بۆ قوتابییەکان ئاسان دەبێت، پێویستە مامۆستا بەگوێرەی ئاستی تێگەیشتن و فیکری قوتابیان وانە بڵێتەوە، خۆی بهێنێتە ئاستی لاوازترین قوتابی ئەگەر ئەو لە بابەتەکە تێگەیشت ئەوە بێگومان هەموو قوتابیان لە بابەتەکە تێگەیشتوون.

# گەنجان و ئیرادەی بزاف

نوسینی: هیوا حسێن

ژیان ئەوپانتاییەیە کە گشت چین و توێژ و تواناو ئاست و تەمەنەکان تیایدا گوزەر دەکەن پاش ئەوەی مانایەك دەبەخشن بەژیان و پەنجەمۆرێك لەسەر لاپەڕەکانیدا جێ دەهێڵن، بەواتایەکی تر ژیان بریتییە لەجم و جۆڵ و بزاڤ و گەشەونما و ڕەنج و بەخشین و ململانێ و کێبڕکێ و عورووج و بەرزبوونەوە بەرەوە کەمالات و بەها بڵندەکان.

لەکتێبی (لسان العرب)ی ابن منظوردا هاتوە کە (أبو رؤية العجاج)ی تابعی لەنیوە دێڕی قەسیدەیەکدا دەڵێ: (وكانت الحياة حين حيت). زۆر بەجوانی تێی گەیشتوە کەژیان دوور لەو وتەو واتاو دەستەواژانەی سەرەوە هیچ مانایەکی نابێت، لای ئەو ژیان لەو ساتەوەختانەوە دەستی پێکرد کەمرۆڤەکان تیایدا پەرش و بڵاو بوون و ڕابیتەو پەیوەندی و هزرەکان داهاتن و ڕق و خۆشەویستی و ناشرینی و جوانی و تووڕەبوون و هێمنی و ئیرەیی و ئیثار، گشت ئەم بەهایانە لەخولگەی ژیان دا پێگەی خۆیان دانا، ئەوسا یەکەم ترپەی دڵی ژین لێیداو بوە دەسپێکی مرۆڤایەتی.

لەم بابەتەدا هەوڵ دەدەین تیشك بخەینە سەر توێژێك لە کۆمەڵانی خەڵك کە بەبنچینە و هێزی لەبن نەهاتووی کۆمەڵگە دادەنرێت،ئەم توێژە گوڕ و تینی جەستەی شەکەتی کۆمەڵگەیە، ئەم توێژە خوێنی تازەو ئاڵ و گەشە بەناو دەماری کۆمەڵگەدا دەسوڕێ و ڕۆح و ژیانێکی نوێی وەبەر دێنێتەوە، کەئەویش توێژی گەنجانە. ئێمە کەڕۆڵی گەنجان بەرز دەنرخێنین لەبەر ئەم هۆیانەی سەرەوەو چەندین هۆی تره کە گرنگترینیان ڕۆحی تەحەدایە لەناو گەنجان و ڕزگاربوون لەکۆت و پێوەندی حیزبایەتییە لەناو ئەم توێژە، دەنا پرۆسەی چاکسازی و بزاڤی گۆڕانکاری کۆمەڵگە قۆرخ نیە لەسەر تەنها ئەم چینە بەدەر لەچینەکانی تر، چونکە ئەمە ئەرکێکی پیرۆزی گشت تاکەکانی کۆمەڵگەیە. بۆ پێناسەی گەنجانیش پشت بەڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان دەبەستین کەگەنج پۆلێن دەکەن تەمەنی لەنێوان ١٥—٣٥ساڵ بێت، لەم قۆناغە گشت توانا جەستەیی و هزرییەکانی بەرەو کامڵ بوون دەچێت. لەم تەمەنەدا کەمی ئەزموون و بەهێزی عاتیفەو سۆزە دەروونیەکان هاوشان لەگەڵ جورئەت دا پاڵنەر و هاندەری سەرەکین



بەرەو دەربازبوون لەبازنەو پەیوەندی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و نۆشین لەکانیاوی مەعریفە و ڕۆشنبیری هاوچەرخ و تازەگەری، هەروەها پاڵنەرە بۆ بەرەنگاربوونی شەپۆلی بەرزی دەریای داهێنان و ڕۆچوون بە قووڵاییەکانیدا بەئومێدی گەیشتن بەگەوهەری شاراوە. بەڵام لەم گەشتی پشکنین و عەوداڵ بوونەدا چەمکە ڕاست و هەڵەکان ئاوێزان و دەست لەملانی یەك دەبن وئەستەمە گەنجان لێکیان بکەنەوە گەر دەستگیری یان نەکرێت و نەخرێنە سەر ڕاستەشەقام و هەنگاو بەهەنگاو لە زۆنی بەمین چێنراوی فیکری ڕووخێنەر و هاوردەو نامۆ ڕزگار نەکرێن.

ئەم باسە هەوڵێکە بەپێی تواناو دەرەفەت بۆ دیاری کردنی مەشخەڵی ڕێ و بنەمای پێویست وەکو ئامادەباشیەك بەرلەوەی گەنجان بێنە گۆڕەپانی شەرەپاڵی فیکرو ململانێی شارستانی.

گەنجی هۆشیارو زرنگ لەو بنەما گرنگانەی کەپێویستە ڕەچاو بکرێن ئەمانەن:

**١- تێرامان و تێفکرین:**

ئەمەخاڵی بەرێکەوتنە بەرەو ئەو چەمکانەی پێشتر باسمان لێوە کردو، ئەمە وروژێنەری عەقل و دڵ و گشت لەتائیفەکانی تری مرۆڤە. دانیشتنەو دیالۆگە لەگەڵ خودی زات و تێرامانە لەناخ و ڕەهەندەکان بەمەبەستی گەیشتن بە وەڵامی پرسیارێکی زۆر کۆن و مێژوویی پەدرێژایی مێژووی مرۆڤ کە گشت پێغەمبەران و فەیلەسوف و دانا و زانایان عەوداڵی بوون، کە ئەویش سێ کوچکەی (خواناسین و مرۆڤ ناسین و ژیان ناسین)ە. کەئەمەش لوتکەی گشت مەعریفەکانە. پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت لێرەوە تێپەڕبوون و گوزەریان کرد و دوور لەجەنجاڵی ژیان ولەبارودۆخ و کەشێکی ئارام دا بەباڵی ڕۆح ئەی ئاسمانەکانیان دەکردو پەردەکان دادەماڵران و خۆری حەقیقەت بەدەر دەکەوت.

ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێت باشترین نموونەی قورئانیە کاتێك کەڕوانیە ئابلۆی ئاسمان و سەری سوڕما لە جوانی و ڕازاوەیی ئەم تابلۆیە بە ئەستێرەو مانگ وخۆر، پاشان بەهیدایەتی خوای میهرەبان پشت ئەستوور بەفیترەی پاك و بەڵگەو نیشانەی عەقڵی گەیشتە ئەو مەبەستەی کەوێڵ بوو بەدووی، ئەم خاڵە زۆر بەساناو ساکار تەماشا نەکەین، چونکە ئەمە خاڵی دیاری کردنی دیدو تێڕوانینە هەموو گەنجێکیش ئەو جورئەتەی بۆ پەیدا نابێت بۆساتەوەختانێکیش بتوانێت ئاوێنە ئاسا لەبەردەم ناخ و زاتیدا بوەستێت کەمرۆڤ خۆی دەبینێت دوور لەڕووپۆش کاتێك کەدەمامکەکان دەکەون و پەردەکان دادەدڕێن ئەوسا دەردەکەوێ ئەم مرۆڤە لەکوێی کۆمەڵگە لەنگەری گرتووە غەمەکانی غەمی ئومەتە یان هێشتا لەبازنەی نەفس و زات دا قەتیس وەستاوە. گەورەیی و بەهای مرۆڤەکان لێرەدابەدەردەکەوێ، بۆیە قورئان دەربارەی ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموێ (ان ابراهیم کان أمة لله حنیفا ولم یك من المشرکین) النحل ١٢٠

زاهید و حەکیمی خواناس سحنون لەم بارەیەوە دەڵێ ((من تفرس فی نفسه فعرفها. صحت له الفراسة في غیره وأحکمها))الرقائق/محمد أحمد الرشد ص٨

**٢- بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری:**

گەنجی بەڕێزو خۆشەویست ئێستا پاش ئەوەی کەزات و ئیرادەت ئازادکرد و

## هیممەت بەرزی و پشوو درێژی گرنگترین سیفەتە بۆ ئارەزوو مەندان و ڕێبوارانی ڕێگای سەرفرازی و بوژاندنەوەی گەلان

لەخولگەی خۆپەرستی و خۆساڵارێدا دەربازبووی و بڕیارت دا ببیتە ئەندامێکی کاراو ئەکتیڤ لەکۆمەڵگەداو پەیامی چاکسازی بگریتە ئەستۆو ئەم بارە قورسە لەکۆڵ بگری. نەوەکو ببیت بەبار بەسەر دونیاوە، هەروەکو ئەدیب و بلیمەت مصطفی صادق الرافعی دەڵێ (اذا لم تزد شیئا علی الدنیا، کنت أنت زائدا علی الدنیا) وحی القلم ٢/ص٨٠.

ئێستا تەوەرێکی گرنگ دێتە پێش کە بایەخێکی ئێجگار زۆری هەیە، کەئەویش بونیادی مەعریفی تاکە، یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی قۆناغی پێش ئەم ڕاپەڕینە زانستی و مەعریفییەی کەئێستا ناوچەکەمان و جیهانی پێدا تێدەپەڕێ ئەوەیە کەلەگەڵ چاو هەڵهێنان بینیمان کەسپی پێستەکانی ئەوروپاو ئەمریکا چۆن دەسەڵاتی خۆیان سەپاندووە بەسەر جیهاندا- بەتایبەت ئەم جیهانی سێیەمەی خۆیان وتەنی کە ئێمەی تیادا دەژین -لەگشت بوارەکانی (سەربازی، سیاسی، ئابوری، دارایی، پیشەسازی و سەرجەم بوارەپێشکەوتوەکانی زانستی و ڕۆشنبیری یە جیاجیاکان) . ئەمەبەرچەکردارێکی

سەلبی لەناخ گشت ڕۆشنبیران و بیرمەندانمان دروست کرد کەچۆن هەوڵ بدەن شوێن پێ ی ئەوروپا هەڵبگرن و لاسایی یان بکەنەوە، بەمەش حاڵەتێك دروست بوو کە هەمیشە خۆ بەکەم و بچوك بزانین و بەرامبەریش بەگەورتر. بۆ ڕەوینەوەی ئەم حاڵەتەش دەبێ ئێمەش گشت ڕەسەنایەتی و مێژووی خۆمان فەرامۆش بکەین بەڵکو ڕۆژئاوا بەپاشکۆی خۆیان قبوڵمان بفەرمون!

واقیعی ئێستامان ئەو ڕاستی یە زەقە دەسەلمێنێ کەتا ئەو کاتانەی پابەندبووین بەرەسەنایەتی ئیسلامی خۆمان و ستراتیژی یە زانستی یە کانمان ئازاد بوون لەکۆتی فەلسەفە و مەزهەبە مادیەکان. ئەو ساتانەی کەزانکۆکانمان سەرچاوەکەی قورئان و شەریعەت بوو. گزنگی خۆر بووین بۆ ڕەوینەوەی شەوی تاریکی ئەورووپای نوقم بوو لەنەفامی و نەزانی.

لێرەوە زەروورەتی ستراتیژی داهاتوومان بۆ دەردەکەوێت لەپرۆسەی بونیادنانەوەی ڕۆشنبیری تاکەکان. کەدەبێت هەوڵ بدەن بۆ ڕۆشبیری یەکی گشت گیرو هەمەلایەن و ڕەسەن، نابێت بەهیچ شێوەیەك خۆ نوقمی بەش گەرایەتی و جوزئیەت بکەین. چونکە بایەخدان بەتەنها لایەنێکی فیکری بەدەر لە لایەنەکانی تر. ئەگەرچی ئەم لایەنە مەودایەکی گەورەشی لەئاسۆی فیکر و فەلسەفەشماندا داگیرکردبێت، هەر ون بوونە لەجوزئیەت و زیادە ڕەوی دا. دەمارگیری فیکریش لەم خاڵەوە سەر ئەکێشێ و دەبێتە کێشەکی گەورە بۆمان.

ئێستا لەم سەردەمی جیهانگیری و عەولەمەیەدا زۆر بەئاسانی دەتوانین ئاستی ڕۆشنبیری و زانیاریمان بەرزبکەین و ئاسۆمان فراوانتر بکەین لەڕێگەی ئینتەر نێت و پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەکانی ترەوە. هەر سەرچاوەیەکی زانستیت بوێت دەتوانی لەژوورەکەی خۆت دا بەچەند چرکەیەك ئامادەی بکەیت کەپێشتر نەدەکراو مەحاڵ بوو. بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری تان زۆر هەوڵ بدەن و ماندوو نەبن و بزانن سەرفرازی و خۆسەلماندن و ڕاست کردنەوەی واقیعی شێواو تەنها لەم ڕێگەیەوە فەراهەم دەبێت، پێغەمبەرمان سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموێ (ومن سلك طريقا يلتمس فيه علما سهل الله له طريقا الى الجنة) هەوڵبدەن لەم گەشتی زانینەدا بەردەوام ئاسەواری باش بەجێ بهێڵن و ناسنامەی خۆ بسەلمێنن (خيارهم في الجاهلية، خيارهم في الاسلام اذا فقهوا) أخرجه البخاري و مسلم

لەم حەدیسەوە بۆمان دەردەکەوێت کەچاکخوازان و چاکسازان بەنووری مەعریفەت ئارایش کراون. خوای گەورەش دەفەرموێ (قل هل يستوي الذين يعلمون والذين لايعلمون) الزمر/٩

ابن الأثير دەڵێ (ان الناس لايتساوون في العلم، وانما يتساوون اذا كانوا جهالا) ئەمەش هاوکێشەیەکی بەهێزە لەجیاکرنەوەی تواناکان دا و زۆر بەوردیش ڕاستی یەکەی پێکاوە. کەواتە دەتوانین بەپێ ی ئەم هاوکێشەیە بڵێ ین:

گەشەو بزاف هەمیشە زانست (علم)

چەقبەستن هەمیشە نەزانین (جهل)

### ٣- ئارەزووو هیممەت (الرغبة والهمة)

هیممەت بەرزی و پشوو درێژی گرنگترین سیفەتە بۆ ئارەزوو مەندان و ڕێبوارانی ڕێگای سەرفرازی و بوژاندنەوەی گەلان. ئەوانەی دەیانەوێ ئاسەواری هەمیشەیی و داستانی ژیان تۆماربکەن. ئەوانەن کەئیبداع دەکەن لەهونەری بەدیهێنانی ئاوات و خۆزگەکاندا، ئەوانەن کەبەچاوی گەش و کراوەوە دەنوارنە لوتکە و عومەری کوڕی عبدالعزیز ئاسا هەنگاوەکانیان پەلەتر و ماوەکان کورتتر دەکەن، کاتێك کەدەمیوت (ان لي نفسا تواقة، تمنت الامارة فنالتها، وتمنت الخلافة فنالتها، وأنا الان أتوق للجنة وأرجو أن أنالها).

مرۆڤ دەبێت ئەو ڕاستی یە باش بزانێت کە تواناکانی مەزنن بەڵام لەناخی دا شاراوەن و خەفەکراون، وە دەبێت زرنگ بێت لەهونەری دەرخستنی تواناکانی و هەگیز خۆی بەلاواز نەیەتە بەرچاو،وەکو شاعیر دەڵێ:

أتحسب أنك جرم صغير

وفيك انطوى العالم الأكبر

پێغەمبەری ئازداریشمان سەلامی خوای لێبێت ڕێسایەکی گرنگ و نرخ بەهامان فێر دەکات کەدەفەرموێ (كل ميسر لما خلق له) أخرجه البخاري ٤٩٤٩ ومسلم ٢٦٤٧

کەواتە خۆت بناسەو قۆڵی لێ هەڵماڵەو تواناکانت وە گەڕخەو متمانەشت بەخۆت پێتەوێت. شوێن پێ ی (محمد الفاتح) هەڵگرەو کەشتی ئاواتەکان بەوشکایی ژیان دابەو لەکەناری دەریای عیزەت و سەرفرازی دا دایکوتە. ئەوەش باش بزانە کە هەڵگرتنی ئەم پەیامە ماندووبوون و بەرخودانی زۆری دەوێت و کۆسپ و تەگەرەی زۆریش چاوەڕێتە و تەنها توێشووی ڕێگاشت ئارامی و سینە فروانی یە.

(ئەدیسۆن) داهێنەری تەلیکتریك سەدان جار شکستی هێنا تاتوانی ڕووناکی دەست بهێنێ (هێنری فۆرد) پێش ئەوەی ئۆتۆمبێل داهێنێت. پێنج جار ئیفلاسی کردووە. (کۆلۆنێل ساندرۆس) زیاتر لەهەزار جار لەلایەن چێشتخانەکانەوە دەرکراوە تا توانی بەناوبانگترین خواردن لەجیهاندا دابهێنێت کەئەویش کەنتاکی یە.



بۆیە وتراوە:

همم الأبرار تحيي الرمما

نفحة الأبرار تحيي الأمما

کەواتە سەرکەوتن و گەیشتن بەئامانج نرخ و فیداکاری زۆری دەوێت، دڵنیاش بە ئەو مرۆڤانەی کە بەم کارە مەزنانە هەڵدەستن زۆر کەمن، بۆیە ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ (لا تستوحش من قلة السالكين).

## ٤- کێبرکێ و ململانێ (المنافسة والصراع):

لەسۆنگەی ((قم فأنذر))وە کەدەستپێکی ئەم قۆناغەیەو دەتوانین بیکەین بەمیحوەری گشت بزاڤەکان و گرتنە ئەستۆی ئەرکەکان، بۆمان ئاشکرا دەبێت کەئەرکەکانمان چەندە قورسن و ئاستەنگەکان چەندە زۆرن، بەتایبەتی ئەگەر لەسێبەری ڕێسای ((وقلنا اهبطوا بعضكم لبعض عدو)) البقرة٣٦ بڕوانینە هاوکێشەکان، ئەوسا بەتەواوەتی دەرك بەوە دەکەین کە دوژمنەکان چەندە سەرسەخت و ڕقنن و ڕێگرو کۆسپی ئەم کاروانەن و زۆر جاریش سەرکەوتن بۆ وان دەبێت لەم ململانێ یەدا، بەڵام سەرکەوتنی جەولەیەك نەك گشت جەولەکان.

ژیان بێ ئەم ململانێ یە واتایەکی تەواو نابەخشێت و دەرەنجامی ململانێ یەکەش ناسنامەی ژیانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە چ بەرەو فەرو خۆش گوزەرانی گەر چاکسازان جڵەو بگرنە دەست، یان بەرەو نەهامەتی و فەوتان گەر شەڕخوازان و گەندەڵان جڵەو بگرنە دەست.

ئێمە باش دەزانین کە مرۆڤی چاك خوازو بڕوادار ئارەزووی بە ئارامی و دڵ هێمنی هەیە و بەدوور لەگشت تیشکەکان حەزدەکات لە سوچێکی ئەم ژیانەدا دوور لەچاوی خەڵکی ئەرك و فەرمان و عیباداتی ئەنجام بدات، بەڵام گەر بێت و ئەم مرۆڤە گونجاوە دەست لەبوارەکانی ((دەسەڵات، زانست، حوکمڕانی)) بکێشێتەوە و ناگونجاوێك شوێنی پڕبکاتەوە، ئەم ناشایستەیە ژیان بەرەو چ ئاقارێکی ترسناك دەبات! ئەم ڕاستی یە تفت و تاڵە لەواقیعی ئەمڕۆماندا بەزەقی دەبینرێت. (جريرى) زاهید و خواناس ئەم کێشەیەمان زۆر بەجوانی بۆ شی دەکاتەوە کە دەربارەی زوهد دەڵێ ((هى الدخول فى الزحام، وتمنع سرك)) الرسالة القشيرية/٨٦.

ئەم زانایە چەمکێکی نیجابی گرنگمان فێردەکات کە چۆن خۆمان بهاوینە ئاپۆرەی ژیان و ببین بەبەشێك لەدیاردەکانی و لەبازاڕو دوکانەکانی سیاسەت و ئابوری و ئیدارەو سەرجەم بوارەکانی تر حوزورمان هەبێت هاوکات لەگەڵ بنەمای ئیمانی و دەرەنجامی فیکری و توهرو عیفەتی ڕۆح و. جارجارەش بەپێ ی پێویست بەشێك لەنهێنی یەکانی نەفس و دەروون دەرخەین تەنها بەمەبەستی برەودان و تاودانی ڕێگا و گەیاندنی پەیام کە ئەرك و زەروورەتی چاکسازی وای دەخوازێت. ئیمامی عمر ڕەزای خوای لێ بێت هەواڵی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس لە عەمری کوڕی مەعد کەرب دەپرسێ، ئەویش وەسفێکی زۆر زیرەکانەی سەعد دەکات کە دەلالەتی فەهمێکی قووڵە، دەڵێ ((أعرابى فى حبوته، نبطى فى جبوته)). واتا ئەعرابی و سادەو ساکارە لە هەڵسوکەوت و ڕواڵەت و ڕەفتاری دا. بەڵام نبطی یە لە ئیدارەو کۆ کردنەوەی خەراج و جیبایەت و عیمارەی سەر زەوی دا. مەعلومە کە (نبطى)یەکان دانیشتوانی دێرینی عیراقن بەر لەفتوحاتی ئیسلامی. زۆر کارامەو لیهاتوویوون و خاوەن شارستانیەتێکی مەزن بوون لەبواری تەلار سازی دا. زۆر گرنگە بتوانین ئەم هاوسەنگی یەی (سەغد) پیارێزین لەنێوان ڕواڵەت و جەوهەرماندا. هەر لەم بارەیەشەوە بیرمەندی گەورەی ئیسلامی مامۆستا محمد أحمد الراشد لەکتێبی (بوارق العراق) دا دەڵێ ((ونحن أصحاب المحراب والجهاد والزكاة والعزة والأمل والكرم والشجاعة والحلم، وعلينا أن نثق بأنفسنا وأن نبادر الى احتلال الصدارة فى هذه الحياة بشعور الاستعلاء الايمانى)).

(توینبی) کە یەکێکە لەگەورە فەیلەسوفەکانی مێژوو و خاوەنی بیردۆزەی لەدایك بوونی شاریستانیەتەکانە، بیردۆزەیەکی داهێنا بەناوی (التحدى والاستجابة)) لەدوو توێ ی کتێبە بەناوبانگەکەی (دراسه للتأريخ) دا کەدوانزە بەرگی گەورەیە، دەڵێ ((هیچ شارستانیەتێك بەبێ ئامادەکردنی ژینگەیەکی گونجاو بەمەبستی بەرەنگاربوونەوەی گەلێك نایەتە دی، تەنها ئەو ساتانەی کە گەلان ئامادەباشی بەرەنگاربوونەوەیان هەیە ژیارەکان ڕووناکی دەبینن، دەنا بەناوابوونی -بلیمەتی کەمینەی داهێنەر/ عبقرية الأقلية المبدعة- شارستانیەتەکان هەرەس دەهێنن و دەڕووخێن)).

لەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ڕۆحی بەرەنگاربوونەوەو ململانێ ی فیکری زەروورەتێکی حەتمییە لەپێناو گەڕاندنەوەی حەق و وەلانانی گەندەڵی و ئاراستەکردنی ژیان بەرەو بەختەوەری و لەڕێگای پاراستنی سنوری ئازادی گشت تاکەکان و دەست درێژنەکردنە سەر مافی کەسانی تر، بەم شێوەیە دەتوانین کۆمەڵگەیەکی ئاسودە بەدی بهێنین و ببین بەو ئوممەتەی کەخوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ ((كنتم خير أمة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنكر وتؤمنون بالله)).

# چۆن متمانە بە خۆبوون دروست دەکەین؟

وەرگێڕانی: کیفی شاکر صابر

متمانە بەخۆبوون دەسکەوت و پێشڤەچوونەو هەوڵ و ماندوبوونی دەوێ چونکە متمانە بەخۆبوون خۆرسك نیەو لە گەڵ لەدایك بوونی مرۆڤ نایەتە بوون، ئەو کەسانەش کە تۆ دەیانناسی و خاوەنی کەسایەتیەکی بەهێزو دوور لە دڵە ڕاوکێ و متمانە بەخۆبوونن، هەرگیز نایان بینیت بە شێوەیەکی گرانو ئاڵۆز لە هەڵسو کەوتو مامەڵەیاندا لەهەر کاتو جێگایەکدا، ئەوانە کەسانێکن متمانەیان بە خودی خۆیان بە دەست هێناوە.

## لەناو بردنی متمانە بەخۆبوون

مەبەست لە بێمتمانەیی یان سڕینەوەی ڕۆحی متمانە بەخۆ بوون چیە؟ ئێمە زۆر جار لە کەسانی دەوروبەرمانەوە گوێبیستی ئەو وشەیە دەبین، کە بێتواناو دەستەوسانن، یان متمانەیان بەخودی خۆیان نییە؟!.. متمانە بە خۆنەبوون زنجیرەیەکی پەیوەستەو یەکیان ئەویتر بەدوای خۆیدادەهێنێ، سەرەتا بەم شێوە دەست پێدەکات.

یەکەم: متمانە بەخۆنەبوون..

دووەم: باوەڕبوون بەوەی کە خەڵکانی تر لاوازی و کەم و کورِیەکانت دەبینن..ئەمەش خاڵی سێیەم بەدوای خۆیدا دەهێنێ.

سێ یەم: دروست بوونی دڵەڕاوکێ و ئاڵۆزی، بەهۆی ئەو ڕوانینە هەڵەیەی کە (پێت وایە هەمووکەس لاوازی و کەم و کورِیەکانت دەبینن) بەجۆرێك ئەمە وا دەکات هەندێك ڕەفتارو هەڵسوکەوتی لاواز لە تۆ ببینرێت.. هەروەك باوە ئەم شێوازەت نابێتە هۆی مردنی کەسایەتیت.. بەڵکو سەر دەکێشێ بۆ..

چوارەم: هەست کردن بەشەرمەندەیی.. ئەم جۆرە لە هەست کردن جارێکی تر دەتگەڕێنێتەوە خاڵی سەرەتا وەك ئەوەی یەك هەنگاونەچوبیە پێش..ئائەمەیە لەدەستدانی متمانە بەخۆ بوون و بەهۆی هەستکردنێکی لەم جۆرەوە کە بە بچوکی و نەرێنی بڕوانیتە هێز و تواناکانی خۆت، سەراپای ژیانت تێك دەشکێنێ.. ئیدی تۆی ئازیز بڕیار نادەی لە بەرامبەر نەفسی خۆت هەڵوێست وەربگری و مەردانە لە بەرامبەر ئەو هەست و بیرکردنەوە هەڵەو نادروستانە خۆڕاگری. چونکە گەر وانەکەی ئەوا ئەم هەستە لارە وەك مردنێکی لەسەر خۆ بۆ هێزو تواناو پاڵنەرە ئەرێنیەکانی ژیانت دێتە ئەژمار!؟

خۆئەگەر بڕیاری خۆڕاگریشت دا بەم هەنگاوانە دەست پێبکە..

## دیاری کردنی سەرچاوەی کێشە:

دەبێ سەرچاوەی سەرەکی دروست بوونی ئەم هەستە ناتەندروستە لە کوێوە بێت؟ ئایا توش بوونم بەڕووداوێك لە سەردەمی منداڵیمدا وەکو شەرمەزار کردن و گاڵتە پێکردنم یان بەراورد کردنم بە کەسانی لە من باڵاتر بۆتە هۆکار بۆ ئەم هەستە لاوازەم؟ ئایا هۆکار ئەوەیە کەمن شکستم هێناوە لە شتێکدا بۆ نموونە وەك شکستم لە خوێندن؟ یاخود هۆکار ئەوەبێ یەکێك لە مامۆستاکانم یان لەکاتی کارکردنمدا لەلایەن خاوەن کارەکەمەوە بەبەر چاوی هاوپۆل یان برادەرەکانمەوە ڕەخنەی توندم لێگیراوە یان هەستم بریندار کراوەو تەریقی کردومەوە؟ ئایا خزم و کەس و برادەرانم ڕۆڵیان هەیە لە زیاد کردنی خەم و هەست کردنم بە ئازار؟ ئایا ئەم کاریگەریەی ئەوان تائێستاش هەر بەردەوامە؟؟... هەوڵبدە ئەم پرسیارانەو زۆر پرسیاری تر لە نەفسی خۆت بکە و بگە بە ئەنجام.. ڕاست گۆبە لە گەڵ خۆت... لە هەوڵی ئەوەدا مەبە هەڵەی خۆت بخەیتە ئەستۆی کەسانی تر، تاوەکو بگەی بەسەرەداوی ڕاستەقینەی کێشەکانت بۆ ئەوەی چارەسەری ریشەییان بۆ بدۆزیتەوە، هەوڵ بدە بیرۆکەکانت ڕێك بخەو قەڵەم و کاغەزێك بێنەو هەموو ئەو شتانە بنوسە کە بە بۆچوونی خۆت بەشداریان هەیە لە دروست کردنی ئەم هەستی بێ متمانەیی بەخۆ بوونەت، بگەڕێ بەشوێن هۆکارە سەرەکی و لاوەکیەکان کە بونەتە هۆی کەڵەکە بونی ئەم گرفتە ڕوخێنەرە.

## گەڕان بەدوای چارەسەر:

دوای ئەوەی توانیت سەرچاوەی کێشەکەت بدۆزیتەوە، ئینجا دەست بکە بە گەڕان بەدوای چارەسەر..تەنها بە دەستنیشان کردنی کێشەکە، دەرگاکانی چارەسەر دەخرێنە ڕوو... لە شوێنێکی ئارام دابنیشەو لە گەڵ نەفسی خۆت بکەوە گفتوگۆ، هەوڵ بدە بیرۆکەکانت پەرت نەبێت و ڕێکیان بخە... چ شتێك دەمگەیەنێت بەوەی کەبتوانم زاڵبم بەسەر ئەو مەترسیەو متمانە بوون بە نەفسی خۆم بگێڕمەوە؟ ئەگەر هاتوو خزمانت یان هاوڕێکانت لایەنێك یان هۆکاری سەرەکی بوون بۆ لەدەستدانی متمانە بەخۆبوونت،.. هەوڵ بدە هەست و نەستت ئارام بێت و بیر لە تۆڵە مەکەوە، نەك لەبەر ئەوەی کەناتوانی بەڵکو ئەم کارە سودێکی نیە بۆ چارەسەری گرفتەکەت، بەڵکو دەبێت بەبەشێکی تر لە کێشەکەت و ئاسۆی چارەسەرو ڕزگاربوونت لەم بێ متمانەییە دوورتر دەبێتەوە

قەناعەت بەخۆت بێنەو بەردەوام ئەم وتانە بکە بەدروشمی ژیانت، بڵێ مافی خۆمە متمانەی زۆر بەرزم بەخۆم و هێزوتواناکانم هەبێت. مافی خۆمە لەم لایەنە نەرێنیەی ژیانم ڕزگارم بێت.دەبێ سەرکەوم بەسەر گرفتەکانم.

سەرچاوە: www.moudir.com

# ڕێکخستنی کات

**ئا: زیار**

ئەمڕۆ مرۆڤ لە هەموو ڕۆژگارێك زیاتر شێوازەکانی ئاسانکاری فەراهەم کردوە، ئەو ڕێگایەی جاران بەمانگێك دەتبری، ئەمڕۆکە بە کاتژمێرێ دەیبری، ئەو هەواڵەی بە هەفتەیەك پێت دەگەیشت، ئێستا بە چەند چرکەیەك دەگاتە لات، ئەو کارانەی بە مانگێك ڕێکت نەدەدخستن، ئەمڕۆکە بە ڕۆژێك ڕێکیان دەخەیت. ئەمانە هەمووی دەرەنجامی ئەو تەکنەلۆجیایەن، تا ئەو ڕادەیەی بیرمەندێك لە وتە بەناو بانگەکەیدا دەڵێت [جیهان بۆتە گوندێکی بچوك] لەگەڵ هەمو ئەمانەشدا ئێمە هەست دەکەین کات بەشمان ناکات! هەست دەکەین تێکەڵاویەك لە کات هەیە جاران کاتەکان بەشی خێزانو سەردانو خوێندنەوە وتەلەفزیۆنو...هتد دەکرد. ئێستا کاتەکان بەشی ئاگابوون لە تەندروستی خۆمان ناکات! خۆمان ماندو دەکەین. خەو لە خۆمان حەرام دەکەین. کە هەر ناگەینە ئەو ڕادەیەی هەست بکەین کاتی تەواو مان بۆ هەموو شتێك هەیە! لە ڕاستیدا تێگەیشتنی ئێمە بۆ کات زۆر هەڵەیە، هەروەك تێگەیشتنی ئەو دارتاشەیە،کەوا ڕۆژانە بە تەورەکەی داربڕی دەکرد، بەڵام بە تێپەر بوونی کات تەورەکەی کوول بوو،بۆیە کاتێکی زیاتری دەویست بۆ داربڕین، کاتێك یەکێك پێی گوت. ئەگەر تەورەکەت تیژ بکەیتەوە، زووتر دارەکان دەبڕیت، ئەو لە وەڵامدا پێی گوت من خەریکی دار بڕینم، کاتم نییە بۆ ئەمە!

لەم چیرۆکەدا بۆمان دەردەکەوێت ئێمە کاتێکی زۆرمان هەیە، بەڵام نازانین چۆنی ڕێك بخەین، دەبێت ئەوە بزانین کەوا ڕێکخستنی کاتژمێرێك لە کات، کاری ڕۆژێکمان بۆ دەگەڕێنێتەوە.

### کێن ئەوانەی کاتی خۆیان ڕێک دەخەن:

بێگومان کەسێك نییە بڵێت من نامەوێ کاتی خۆم ڕێك بخەم، لەگەڵ ئەوەشدا کەمن ژمارەی ئەو کەسانەی کە دەتوانن کاتەکانیان ڕێك بخەن. کەسانێکیش هەن ئەوەندە گرنگی بە ڕێکخستنی کات نادەن، ئەگەر ئامانجێك لەژیان نەبوو ئەوا مرۆڤ هەوڵی ڕێکخستنی کات نادات. بەڵکو لێی دەگەڕێت ولەناو فەوزادا جێی دەهێڵێت، بوونی ئامانج ودیاریکردنی ئامانج دوو فاکتەری گرنگی ڕێکخستنی کاتن.ئەگەر مرۆڤ سەرکەوتووبوولە ڕێکخستنی کات،واتە سەرکەوتوو بووە لە ڕێکخستنی ژیان، پێچەوانەکەشی هەر دروستە.

### ئایا مرۆڤ کات دەکوژێت، یان کات مرۆڤ دەکوژێت؟

زۆر کەس هەن دەڵێن کاتمان نییە بۆ ئەنجامدانی زۆر شتی گرنگ لە ژیانماندا، باوا دابنێین ڕۆژانە لەماڵ بۆ شوێنی کارکردن بریتیە لە [٢٠] خولەك ڕێکردن ئەگەر پێنج ڕۆژلە هەفتەیەك بێت ئەوە دەکاتە [١٠٠]خولەك لە پێنج ڕۆژو [٨٨]کاتژمێر لە ساڵێکدا ئەمە هەمووی کاتە لە ژیانمان دەڕوات. ئەگەر ئەو کاتە لە ناو ئوتومبێل بوین دەتوانین گوێبگرین بۆ بەرنامەیەکی سود بەخش، ئەگەر لەناو پاس یان تەکسی بوین، دەتوانین کتێبێك بخوێنینەوە، بەم شێوەیەش زۆر کات هەن کە بە فیرۆ دەڕۆن.لە کاتێکدا ئێمە دەتوانین سودیان لێ ببینین.

### چۆن دەتوانین کاتەکانمان ڕێکبخەین؟

ڕێکخستنی کات پێویستی بە پلان دانان هەیە. پێویستە ئەو ڕاستیەش بزانین کە هەمیشە کاتمان هەیە بۆ ڕێکخستنی کات. ئەگەر نەتوانین ڕۆژانە کاتە کانمان ڕێکبخەین ئەوا لانی کەم پێویستە هەفتەی جارێك بەکارەکانی ڕابردومان دابچینەوەو پلان و کاری داهاتوو دابنێین. دەتوانیت ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێیت بۆ ڕێکخستنی کات.

١-لیستێك دروست بکە بەو کارانەی کە دەتەوێت ئەنجامی بدەیت.

٢-ئەو کارانەی گرنگترن لە پێشتر دایان بنێ، ئەو کارانەش کە لەیەك نزیکن لە تەك یەکیان دابنێ.

٣-ئەگەری ئەوە دابنێ هەر کارێکت نەکرد، جێگرەوەی هەبێت. تاوەکوکاتت لێ بە فیرۆ نەچێت.

٤-ئەگەری میوان،نەخۆشی، تازیە، لە پلانەکانت دابنێ.

٥-ئەو کاتە بقۆزەوە، کە بێکاریت وەك گوێگرتن لە هەواڵەکان، لە ناو ئوتومبێل دا، خوێندنەوەی ڕۆژنامە لەکاتی چاوەڕوانیدا.....

٦-هەموو ڕۆژێك کاتێك تەرخان بکە، بۆ گەشە پێدانی خۆت.

٧-هەوڵبدە کاتژمێری بایلۆژی پەیڕەو بکە بەوەی ڕۆژانە لە کاتێکی دیاری کراو نان بخۆیت، لە خەو هەڵسیت.....

ئەمانە هەمووی مانای ئەوە نیە ئێمە وەك کاتژمێر کار بکەین. بەڵکو دەبێت دەرفەت بۆ، چێژ وەرگرتن، سەردان، گەشت و گوزار بمێنێتەوە.

# چەندێتی و چۆنیەتی خۆراک

**د.برهان ئەحمەد بالەکی/ دکتۆرا کیمیای ژیانی**

لە رۆژگاری ئێستادا چەند ووشەیەك هەن کە زۆرجار بەرگوێ دەکەون وەك جۆر Quality وە چەند (بر) Quantity کە بۆ تەواوی شتەکان دەتواندرێت بەکار بهێندرێت. لە بابەتی خوراك و تەندروستیش ئەم دوو زاراوانە بە واتا جێ بەجێ کردنەکەی (پراکتیکی) کاریگەری زۆری دەبێت لە سەر گەشە Growth و تەتدروستی Health لەش.

جۆری خۆراك Quality of nutrients: واتە تۆ چەند جۆری خواردن (لە دانەوێلە و سەوزە و و میوە و گۆشت و شیر و بەرهەمەکانی و خواردنەوەکان) لە رۆژێکدا (٢٤ کاتژمێر) دەخۆیت وە جۆری ئەم خۆراکانە گەشە و تەندروستیت دیاری دەکەن. ئەگەر کەسێك لەماوەیەکی درێژ گورانکاری نەکات لە جۆرەکانی خۆراکی ئەوا بێگومان هەرچەندێك بخوات توشی بەد خۆراکی دەبێت. کەوابوو بەدخۆراکی بە واتایی نەخواردنی خۆراك نایەت بەڵکو و بریتیە لە نەگۆرینی جۆری خۆراك بۆ ماوەیەکی درێژ، ئەمەش لەبەر ئەوەی یەك جۆری خواردن تەواوی پێکهاتە سەرەکیەکانی خۆراك بۆ زیندە چالاکیەکانی Metabolism لەش دەستەبەر ناکات و دەبێتە هۆیی کەم بوونی بەشێك لە پێکهاتە و کانزاکان لە لەش بەمەش مرۆڤ توشی نەخۆشی و نا تەندوستی دەبێت.

بری خۆراك Quantity of nutrients: دەکاتە بری ئەو خۆراکەی لە ژەمێك یان لە رۆژێکدا (٢٤ کاتژمێر) دەخورێت لە لایەن کەسێکەوە، بێگومان ئەم برە زۆر هۆکار کاری تێ دەکەن وەك تەمەن، کێشی لەش، ئاو و هەوا، جۆری کارکردن. ئەوەی لێرە مەبەستمانە کەسێکی پێگەیشتو یان سەروی تەمەنی ٣٠ساڵ کە کاری نوسینگەی و فەرمانبەری نوسینگەی ئەنجام دەدات کە زۆر پێویستە بر یکی



زۆری خۆراك لە دەمیەوە فرێ نەداتە نێو گەدەیەوە چونکی بە قوت دانی یەك پاروی خواردنی زیاد گیروگرفتی گەورە بۆ لەش دروست دەکەیت. یەك پارو نان ئەگەر هیچ گورانی بەسەر نەیەت (واتە هەرس نەکرێت و نەمژرێت) پێویستی بە ٦ تا ١٠ کاتژمێر هەیە تا لە رێی پاشەرۆیەوە دەربچێت، خۆ ئەگەر گۆرانی بەسەرداهات و پێکهاتەکان مژران (Absorption) و چونە ناو خوێن ئەوسا کاتەکە چەندجارە دەبێتەوە، بۆیە دەبێت بزانیت کە گەدە مالی نەخۆشیەکانە وە زۆربەی نەخۆشیەکان لە رێ ی گەدە و بری خۆراك و جۆری خۆراکەوە توشی ئادەمیزاد دەبێت.

لەگشت بوارەکاندا جەخت لە جۆریەتی کاڵاکان و خۆراکەکان دەکرێت و کۆنترۆل دەکرێن پێیی دەڵێن کۆنترۆڵی جۆری Quality control تۆش دەبێت لە خاڵی سنوریت (واتە لە دەست و دەمت و ئارەزوت) ئەم کۆنترۆلە ئەنجام بدەیت، پێش پاروو خستنە ناو دەم و قوت دانی تەواوی پشکنینی بۆ بکەیت و بزانیت ئایا بەراستی برسیتە و پێویستت بە خۆراکە؟ یان خواردنێك هەیە و دەتەوێت بیخۆیت؟ ئایا خواردنەکەت پاك و تەندروستە؟

هەوڵ بدەن خۆراکەکانتان بە تام و چێژی خۆیان بخۆن نەك بە شەکر و خوێی زۆر کە زۆربەی کەس ئەم کارەدەکەن.

وەباشترین ئامێر و کەرستە بۆ ئەم پشکنینانە بریتیە لە شارەزا بوون لە پێکهاتەی خۆراکەکان و بەها و بری وزە لە خۆراکەکان و پێویستی لەش بە پێکهاتە خۆراکیە سەرەکیەکان.

ژیان بە رێك خستنی خۆراك شادی و خۆشی تێدایە وە بە ئاسودەی سەردەنێتەوە و کۆچ دەکەیت بەڵام بە جێ بەجێ کردنی ئارەزو وە حەزت و دانەنانی کونترۆڵ ژیانێکی پر بۆنی ناخۆشی دەم و ددان و ئێشی گەدە و غازاتی سك و تورەبوونی قۆلۆن وە هەروەها کەوتنێکی درێژخایەن لەسەر جێگە و مردنێکی پر ئازار.

بۆ خۆشگوزەرانیت و ئاسودەبوونی لەشت برێکی کەمی خۆراك و جۆری زۆری خۆراك هەلبژێرە

# دایکم پەروەردەی کردم

دایکم بەم شێوە پەروەردەی کردم
پێی ڕاگەیاندم کە نەوەی کوردم
دوو ڕێگە بۆ من سەرفرازییە
هەتاکو مردن جێی شانازییە
یەکەم لە ڕێگای خودا دانەبڕێم
هەتا ئەو ڕۆژەی لە ناو گۆڕ ئەنرێم
لەو ڕێگە ڕاستەی کە ئەو دایناوە
پارێزەری بم تا هێزم ماوە
دووەم من ڕۆڵەی ئەم نیشتیمانەم
کە لە پێشترەلەم دڵ و گیانەم
ئەبێ تا ئەمرم پارێزەری بم
قوربانی بۆ بدەم خەم لابەری بم
قوربانی دانیش بە چەند شێوازە
ئەنجامی بدەم بەبێ ئەندازە
بە پلەی یەکەم خوێندەوارییە
کە نیشاندەری ڕێی ڕزگارییە
چونکە لە ژیان تەنیا خوێندنە
هەر ئەو پێناسەی هۆشیاری منە
ئیتر پێشکەوتن بە دەست دەهێنم
تەوقی نەزانی و دیلی ئەشکێنم
نایەڵم چیتر بچەوسێمەوە
لە ناسنامەی خۆم بکوژێمەوە
ڕووبەڕووی زوڵم و ستەم ئەوەستم
بۆ نا یەکسانی ژیان بەربەستم
ئەگەر نەزان و نە خوێندەوار بم
ئەبێ بۆ خەڵکی لە ژێر بێگار بم
ڕەنج و هیلاکیم خەڵکی تر بیخوات
من برسی و ئەویش سکی تێر بکات
کە وابوو تا سەر ئەبێ بخوێنم
داوای دایکی خۆم بەجێدەهێنم
ئەمە پەروەردەی دایکی شیرینم
ڕێگای ڕزگاری بۆ هەردوو ژینم

قوتابی لە ئامادەیی ژیاری نموونەیی

# خواردنی تەندروست

د.سلیم سعید



تەندروستی ژیانت وابەستەی جۆرو شێوەی خواردنەکەتە، پاشەڕۆژتە و داهاتووتە، بۆیە زۆر گرنگە مرۆڤ خواردنەکەی بە گوێرەی نوێترین زانیاری و ڕێنامیی تەندروستی بێت، هەموو مەرجەکانی خواردنی تەندروستی تیا بێت.

هەموو مرۆڤێك پێویستە گرنگیەکی زۆر بە خواردنی بدات و ڕەچاوی هەموو ڕێنماییە تەندروستیەکان بکات، چونکە خواردن دەبێت هەردەم هەمەجۆر و کەم بێت نەك زۆر و سنووردار بێت بۆ چەند جۆرێك.

بەڵام سیستەمی خواردنی تەندروست دەبێت هەر لەمنداڵیەوە بەرنامەی تایبەتی بۆ دابڕێژرێ و هەموو لایەنەکانی ڕەچاو بکرێت بۆ ئەوەی ئەو منداڵە بەشێوەیەکی تەندروست و ئاسایی گەشە بکات و لە داهاتووشدا مرۆڤێکی تەندروستی لێ دەربچێت، هەروەها لەپاشە ڕۆژیشدا بتوانی خێزانێکی تەندروست دروست بکات.

لە وڵاتانی پێشکەوتووبەتایبەت سوید زۆر گرنگی بە خواردن دەدەن و بەتایبەتی منداڵ هەموو زانیاریەکی دەربارەی تەندروستی و خواردنی تەندروست فێر دەکرێن.

بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١. کەم بخۆ.

٢. خواردن لەسەرخۆ بخۆ.

٣. هەوڵدە هەردەم خواردن بەساردی بخۆ، بەتایبەتی چا.

٤. لەداوەت و داوەتکاری ستایلی خواردنی خۆت تێک مەدە.

٥. لەکاتی خواردن تەلەڤزیۆنەکەت دابخە و سەیری مەکە.

٦. ئاو کەم بخۆرەوە لەکاتی خواردن.

٧. لە جیاتی ئەو ستایلەی باوە لەناو خەڵکی، شێواز و ستایلی خواردنت بگۆڕە بەم شێوەیەی خوارەوە، با هەردەم خواردنەکەت بە پێوانەی قاپێك بێت:

ڕۆژانە لە جیاتی ٣ ژەم خواردنەکەت دابەشی ٦ جەم بکە، ٣ ژەمی سەرکی و ٣ ژەمی لاوەکی.

٨. یاسای ڕۆژی پینچ جار بەکێنە:

ڕۆژی پێنچ جار سەوزەومێوە بخۆ.

ڕۆژی لەهەر پێنچ جۆر خواردن بخۆ: کەئەمانەن:

شیرەمەنی، کاربۆهیدرات، پرۆتین و چەوری، سەوزە و مێوە.

٩. دوای نانخواردن بۆ ماوەی ١٥-٣٠ خولەك رابکشێ.

١٠. خواردنی چەوری و شیرینی و سوێری کەم بکەوە.

# دەروازەیەک بۆ تەندروستی گەنجان

(بەش یەکەم)

د. شێرزاد علی/ دکتۆرا لە پزیشکی کۆمەڵ

## گەنج کێیە؟

لێرەدا پێش ئەوەی بچمە ناو باسەکەم بە پێویستی دەزانم پێناسەسەیەکی زانستیانەی گەنجان بکەم. بەگوێرەی پێناسەی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (هەرزەکار بەو چینەی لە نێوان تەمەنی ١٠- ١٩ ساڵ دەگوترێت) وە (گەنجیش لەنێوان ١٥- ٢٤ ساڵ)، جا ئەگەر بمانەوێت پێویستیە تەندروستیەکانی ئەو دوو چینەو چۆنیەتی دەستەبەر کردنیان باس بکەین ئەوا باشترە بڵێین: (گەنج بەو چینە دەگوترێت لە نێوان تەمەنی ١٠- ٢٤ ساڵ بەهەردوو ڕەگەزی نێرو مێ).

## گەنج: قۆناغی گەشەو گۆران

گەنجی بە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیان دادەنرێت کە تیایدا تێبینی چەندەها گۆرانکاری لە لەش و ئاستی بیرکرنەوەو فێربوون و دەروون و ئاستی کۆمەڵایەتی و خۆی دەکات و بەمەش تێڕوانینی بۆ خۆیو بۆ دەوروبەریشی دەگۆڕێت، گرنگترین ئەو گۆڕانکاریانەش بریتین لەمانەی خوارەوە:

### ١. گۆرنکاری لە لەش:

لەوانەیە یەکێك لە گۆرنکاریە هەرە دیارەکان بریتییە لە گۆڕانکاری لەش. ئەم گۆڕانکاریانەش بە گەورەبوون و درێژبوونی لەشی دەست پێدەکات و ئەندامی زاوزێی گەورە دەبێت و توانای زاوزێی زیاد دەکات، تەنانەت ڕێژەی گەشە لەو قۆناغەدا (جگە لە کۆرپەلە لە سکی دایکی) بە خێراترین قۆناغی گەشە دادەنرێ لە ژیانی مرۆڤدا، ئەم قۆناغەش جۆرە نا ئارامیەك لا گەنج دروست دەکات.

### ٢. گۆڕانکاری لە ئاستی عەقڵی و بیرکردنەوە:

ئاستی بیرکردنەوەو لێکدانەوە لای گەنجان زۆر بە خێرایی زیاد دەکات لەگەڵ کاردانەوەی ئەو کارانەی ئەنجامی دەدات، ئەو گەشەیەش یارمەتیەکی وای لێدەکات زۆرترین زانیاری کۆبکاتەوەو بەبەردەوامی کارامەیی نوێ بە دەست بهێنێت تا بتوانێت بڕیارو هەڵوێستی خۆی لە ژیانی ڕۆژانەی بدات.

### ٣. گۆڕانکاری لە ئاستی دەروونی و سێکسی:

زۆربەی گۆڕانە دەروونیەکان لەم قۆناغەدا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیوەستە بە گۆڕانکاریەکانی لەش. لەبەر ئەوەی ئەو گۆڕانکاریانەی لەشی بە نامۆ دەزانێت و ماوەیەکی دەوێت تا بتوانێت خۆی بگونجێنێت لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانە. لێرەدا بیر لەو گۆڕانکاریانەی لەشی دەکاتەوە تا بتوانێت تێیان بگات.

### ٤. گۆڕانکاری لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی:

پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لە تەمەنی گەنجان تایبەتمەندیەکی بە خۆوە دەبینێت، بە هۆی فراوان بوونی بازنەی پەیوەندیەکان لە خێزانەوە بۆ هاوڕێ لە هەمان تەمەن یان لە تەمەنی گەورەتریش. بۆیە هاوڕێ لەو قۆناغەدا ڕۆڵێکی یەکجار کاریگەری دەبێت لە ژیانی گەنج، چەنکە حەز بە ئینتیما بۆ کۆمەڵ دەکات بەهۆی ئەو نا ئارامیەی دووچاری بوەتەوە بەهۆی گۆڕانکاریەکانی لەشی. بەمەش گەنج حەز لە سەربەستی و ئازادی دەکات و دایك و باوکیش نایانەوێت بێئاگا بن لە منداڵەکەیان. بۆیە لێرەدا جۆرە بەربەرەکانییەك لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی دروست دەبێت.

## بۆچی گرنگی دان بە تەندروستی گەنجان؟

• بەگوێرەی ئامارەکان، ژمارەی گەنجان لە سەرتاسەری دونیادا دەگاتە نزیکەی ١,٨ ملیار، لەوانە ٨٥٪ یان لە وڵاتە تازە پێگەیشتوەکانن. لە عێراقیش ژمارەیان لە ساڵی ٢٠٠٨ گەیشتە نزیکەی ١,٦ ملیۆن و لە ٢٠٪ی ژمارەی دانیشتوان پێك دەهێنن و چاوەڕوانیش دەکرێت ژمارەکە بگاتە ٧,٥ ملیۆن لە ساڵی ٢٠١٥.

• سەبارەت بە پەروەردە، ڕووپێوەکان دەیسەلمێنن کە ٦,٢٪ی ئەو گەنجانەی تەمەنیان لە نێوان ١٠-٣٠ ساڵە لە عێراق نەخوێندەوارن یان نەچوونەتە قوتابخانە، وە لە بەرامبەر ئەوەوە تەنها ٤١,٨٪ی ئەو گەنجانەی تەمەنیان لە نێوان ١٥- ٢٤ ساڵن چونەتە خوێندن لە ساڵی ٢٠٠٩، وەزۆربەشیان کوڕن.

•دەربارەی کارکردنیش، ئامارەکانی ڕووپێوی نیشتمانی عێراق دەریان خستوە کە لە ساڵی ٢٠٠٩، ژمارەی ئەو گەنجانەی کار دەکەن و تەمەنیان لە نێوان ١٠- ٣٠ ساڵە بریتین لە ٢٣,٣٪ و لە نێوان ٢٥- ٣٠ ساڵیش ٤٦,٣٪ یە.

• سەبارەت بە لایەنی تەندروستییش: هەمان دەزگا ئاماری نیشتمانی دەری خستوە کە لە گەڵ ئەوەی ٧٢,٦٪ی گەنجان زانیاریان هەیە لە سەر نەخۆشی ئەیدز، بەڵام ٨٣,٧ یان وا تێگەیشتون کە نەخۆشەکانی ئەیدز دەبێت جیا بکرێنەوە، ٨١,١٪ی گەنجانی کچ زانیاریان هەیە لەسەر هۆکارەکانی ڕێکخستنی خێزان بەڵام تەنها ٣٣,٩٪ یان بەکاریان دەهێنن. زیاتر لە نیوەی گەنجان (٦٠,٥٪ کچان و ٥١,١٪ی کوڕان) زانیاریان دەربارەی تەندروستی منداڵبوون (زاوزێ کردن) هەیە، بەڵام ڕێژەیەکی زۆر کەمیان (٣٥,٦٪ لە کچان و ٣١,١٪ لە کوڕان) دەزانن کە خوازبێنی لە نێوان خزمان کاریگەری تەندروستی خراپی لێدەکەوێتەوە.

ئەو زانیاریانەی سەرەوە لەوانەیە پێویستی گرنگی دان بە تەندروستی گەنجان روون بکاتەوەو بە یەکێك لە گرنگیەکانی بەرەو پێش چوونی تەندروستی کۆمەڵ دابنرێت.

## ئەو هۆکارانەی کار لە تەندروستی گەنجان دەکەن:

هەر هەوڵدانێك بۆ دیارکردن وەیان چارەسەرکردنی ئەو گیرو گرفتە تەندروستیانەی گەنجان بە دەستیەوە دەناڵێنن بێ سوود دەبێت ئەگەر ئەو فاکتەرە مەترسیدارانەی کار لە تەندروستیان دەکات بە لەبەر چاو نەگیرێت، ئەو فاکتەرانەش:

### ١. جگەرەکێشان:

لە سەر ئاستی جیهان زۆربەی جگەرەکێشەکان لە تەمەنی هەرزەکاری دەستیان بە جگەرە کێشان کردووە، گەنجە جگەرەکێشەکانیش ژمارەیان تا مانگی ٢٠٠٩/٨ گەیشتە ١٥٠ ملیۆن جگەرەکێش.وەك دەشزانین جگەرەکێشان چەند مەترسی هەیە لە نەخۆشیەکانی پەیوەندیان بە تەندروستی دەم و لێو قوڕگ و سیەکان هەیە.

### ٢. مەی خواردنەوەو بەکارهێنانی دەرمانی هۆشبەر:

توێژینەوەکان دەریان خستوە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان مەی خواردنەوە لە تەمەنی هەرزەکاریو تووشبوون بە هەندێك نەخۆشی و لادانی (سلوکی ) لە تەمەنی دواتر لە ژیانیانداو تەنانەت مردنیش لە تەمەنی لاویدا. ئەمە جگاە لە کاریگەری لەسەر کۆمەڵگاو مەترسی ئانەوە لە هاژووتنی ئۆتۆمبێل و لە دەست دانی کۆنترۆڵ کە ڕۆژانە ١٠٠٠ کەس لە جیهاندا گیانیان لە دەست دەدەن بە هۆی کارەساتەکانی (حوادپ ) ئوتۆمبێل.

### ٣. توندو تیژی:

توندو تیژی بە یەکێك لە هۆکارەکانی مردن لە نێوان گەنجان دادەنرێت، بە تایبەتی لە نێوان کوڕان. لە جیهاندا ڕۆژانە ٥٦٥ گەنج لە نێوان تەمەنی ١٠-٢٩ ساڵ بە هۆی توندو تیژی گیانیان لە دەست دەدەن، لە مانەش ٢٠-٤٠ یان پێویستیان بە نەخۆشخانە دەبێت بۆ چارەسەرکردن.

### ٤.خواردنی ناتەندروست:

زۆر لە گەنجانی کچ و کوڕ لە ئەنجامی بە کارهێنانی (عادات)ی ناتەندروست بە خواردن تووشی جۆرەها نەخۆشی دەبن، وەك بەدخۆراکی، ئەمەش کاریگەریەکی زۆری لەسەر تەندروستیان دەبێت بەتایبەت کچان لە ماوەی سك پڕیاندا. لە لایەکی ترەوە، قەڵەوی لە وڵاتە پێگەیشتوو و تەنانەت تازە پێگەیشتوەکانیش بە یەکێك لە هۆکارە مەترسیدارەکان دادەنرێت کە هەڕەشە لە تەندروستی گەنجان دەکات و تووشی نەخۆشیەکانی دڵ و پەستانی خوێن و ڕەقبوونی خوێنبەرەکان و شەکرەو...هتدیان دەکات.

### سەرچاوە:


١- المسح الوطني للمراهقين والشباب في العراق لعام٢٠٠٩.

٢- سایتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO)

www. who.int

# هۆکاری پشت ئێشەکەت چی یە؟



د. أمير مجيد بقال/ دکتۆراه
لەنەشتەرکەری مێشك و بڕبڕەی پشت

گەر سەیری تونێکاری جەستەی مرۆڤ بکەین دەبینین کەوا بڕبڕەی پشت یەکێکە لە بەشە هەرە گرنگەکانی. کەوا هەڵگری زۆربەی بەشەکانی تری لەشەو زۆربەی جولەکانی تری لەشی مرۆڤ لەوێوە سەرچاوە دەگرن. بڕبڕەی پشت بەشێوەیەکی وا دروست کراوە کەوا بگونجێت لەگەڵ جێ بەجێ کردنی گشت فرمانەکان کەوا پەیوەندیان بە بڕبڕەی پشت هەیە و هەروەها پەیوەندی بەتێنی هەیە لەڕاگرتن و جێ بە جێکردنی فرمانی بەشەکانی تری لەشی مرۆڤ وپاراستنی دڕکە پەتك (حبل الشوكى ) کەوا لەبەشی مێشك درێژ دەبێتەوە تاکو گرێ یە دەمارەکان وئەو دەمارانەی لە گرێ دەمارەکان دەردەچن بۆ پارچەکانی تری لەش و بۆ جێ بەجێ کردنی فرمانی جیاواز لەلایەن ئەندامە جیاوازەکان.

بەکورتی فرمانەکانی بڕبڕەی پشت دابەش دەبێت بۆ دوو تەوەری سەرەکی:

فرمانە جوولەیی یەکان (الحركى ) کەوا پەیوەندی بەهێزی هەیە بۆ جێ بەجێ کردنی فرمانە جولەیی یەکان کە جوولەی بەشەکانی تری جەستەی مرۆڤ پێوە بەندە.

فرمانەدەماریی یەکان (العصبى): - کە ئەمانە دەگرێتەوە:

پاراستن، بۆ نموونە پاراستنی دڕکە پەتك (SPINAL CORD) و ئەو دەمارانەی لە دڕکە پەتك دەردەچن (Nerve roots).

بەستنەوەی بەستەرە شانەکان (Ligaments) بە ئێسکی بڕبڕەی پشت و بەیەکتری.

بەستنەوە و هەڵگرتنی کەللەی سەرو شان و سنگ بەیەکتری.

هاوسەنگی وبەلانس و دابەش کردنی کێشی مرۆڤ بەشێوەیەکی ئەندازەیی ڕێك و پێکی کەوا توانای جوولە (سوڕانەوە بۆ لای چەپ وڕاست) و چەمانەوەی جەستە بۆ پێشەوەو بۆ دواوە و لە هەمان کات بۆ لای ڕاست و چەپی هەبێت.

ئێسکی بڕبڕەی پشت کەوا مۆخی ئێسکی تێدایە، سەرچاوەیەکی سەرەکی یە بۆ دروست کردنی خرۆکە سوردکانی خوێنی لەشی مرۆڤ.

بەکۆگایەکی سەرەکی دادەنرێت بۆ پاراستن و کۆکردنەوەی توخمەکانزاکانی پێویستن بۆ لەشی مرۆڤ.

کەسانێکی زۆر ڕۆژانە بەهۆی پشت ئێشە ئازار دەکێشن، وەسەریان سوڕماوە کەوا دەبێ هۆی چی بێت کەوا تووشی ئەم ئازارە بونەتەوە؟؟

ئەمەش بەهۆی کەمی زانیاریان دەربارەی هۆکارەکانی پشت ئێشەیە. کەچی وا دەرکەوتووە هۆکاری زۆر هەن کەوا دەبێتە هۆی پەك کەوتنی فرمانە جوولەیی یەکانی بڕبڕەی پشت، وە ئەو هۆکارانەش پەیوەندی بە هێزی هەیە بە چۆنیەتی ژیانی ڕۆژانەی ئەم کەسانە، بگرە لە چۆنیەتی دانیشتنی تاوەکو دەگاتە چۆنیەتی نوستنیەوە.

نموونەی ئەم هۆکارانەی کەوا کاری گەری زۆری هەیە لەسەر دروست بوونی

پشت ئێشە ئەمانەن:

* دانیشتن لەسەر زەوی بە شێوەیەکی بەردەوام، کەوا دەبێتە هۆکاری زیاد کردنی فشارێکی ستوونی لەسەر کرکراگەکانی نێوان بڕبڕەی پشت و (Inter vertebral disc) تەقین و لەجێ چوونی کرکراگەکەو پاڵەپەستۆ خستنە سەر درکە پەتك (Spinal cord) یاخود دەمارەکان (Nerve roots) دروست کردنی پشت ئێشەیەکی چاوەڕوان نەکراو.

* کەمی جوولەی (Movement) ڕۆژانەی ئەم تاکە کەسە، کەوا زەمینە خۆشکەرە بۆ زیاد کردنی کێشی مرۆڤ و زیاد کردنی پاڵپەستۆ بە شێوەیەکی گشتی بۆ سەرە بڕبڕەی پشت.

* کێشی زیاد [دەبێتە هۆی داخوران و داروشانی کرکراگەکانی دەورەی بڕبڕەکانی پشتیان داوە. ئەمەش هۆکارێکی گرنگە کەوا ڕاستەو خۆ پاڵە پەستۆ زیاد دەکات لەسەر درکە پەتك یاخود لەسەر دەمارەکانی لە درکە پەتك دەردەچن.

* دانیشتن بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەرامبەر کۆمپیوتەر یاخود TV جا چ لەشوێنی کارکردن بێت یاخود لە ماڵەوە. ئەمەش بەهۆی لاسەنگی دابەش بوونی کێشی تاکەکە بەشێوەیەکی نایەکسان بەسەر بەشەکانی بڕبڕەی پشت.

* دوورکەوتنەوە لە وەرزش و نەکردنی بە شێوەیەکی سیستماتیکی و ڕێك وپێك. کەوا هۆکارێکی گرنگە کەوا دەکات ماسولکەکانی لەش بە گشتی و ماسولکەکانی دەوری بڕبڕەی پشت (par spinal muscle) بەئاسانی ڕەق و گرژ ببن و ببنە هۆکاری سەرەکی پشت ئێشە.

* جولانەوەی لەناکاو بەتایبەتی لە کاتی لەخەو هەڵسانی بەیانیان بەتایبەتی خولانەوەو لاربوونەوە بۆ لای ڕاست و چەپ.



* هەڵگرتنی کێشێکی زۆر، لەکاتێکدا بەپاوە وەستاوی، بۆ دورکەوتنەوە لەم هۆکارە هەموو تاکێك پێویستە دانیشێت لەسەر چینچکان (هەڵقونجان) کاتێك بیەوێت شتێك بەرزکاتەوە هەڵی گرێت.

* سەفەر کردنی دوورو درێژ جا چ بە تەیارە یا بە ئۆتۆمۆبێل بێت.

*خۆ پاراستن لە زەبرە دەرەکیەکان کەوا لەناکامی وەرزش یاخود ڕوداوەکانی هاتووچو بەر بڕبڕەی پشت دەکەون دەبێتە هۆکاری پشت ئێشە و لەدەست دانی فەرمانە سەرەکیەکانی بڕبڕەی پشت.

* بەکار هێنانی ئاودەستی ناسایی وەك لەوڵاتی خۆمان باوە. بەڵکو شێوە ئاودەستی ڕۆژئاوایی زۆر تەندروستە بۆ پاراستنی پشت لە ئازار.

### جۆرو هۆکارەکانی بڕبڕەی پشت

١-هۆکارە بەراییەکانی: (Primary injury)کەئەمانەن:

-هەڵئاوسان و داروشانی پێستی پشت.

-گرژبوون و ڕەق بوونی ماسولکەکانی دەوری بڕبڕەی پشتیان داوە (par spinal muscle spasm).

- لە ڕۆچون و لەجێ چوون و تەقینی کرکراگەکانی نێوانئێسکەکانی بڕبڕەی پشت (Intervertebrul disc hernia ion) [الانزلاق الغضروفي].

-شکانی ئێسکی بڕبڕەی پشت (Vertebral fracture) بەهۆی زەبری دەرەکی [ڕوداوی هاتوچۆ، وەرزش]یاخود ئەو شێرپەنجانەی توشی ئێسکی بڕبڕەی پشت.

-پچڕان و لێك کشانی بەستەرە شانەکانی دەوری بڕبڕەی پشتیان داوە (Ligament tear or spray).

٢-هۆکارە دوو میەکان (Secondary injures).

-هەوکردنی بنچینە دەماریەکان [التهاب جزور الاعصاب] (Never roots inflammation).

-هەوکردنی جوگەکانی نیوان بڕبڕەکانی پشت

-تەسك بوونەوەی شوێنی درکەپەتك زیاد بوونی پاڵە پەستۆ لەسەر درکە پەتك ئەمەش بەهۆی هەڵئاوسانی بەستەرە شانەکانی دەوری درکە پەتکیان داوە.

- نەخۆشیە زك ماکیەکانی تووشی بڕبڕەی پشت و درکە پەتك دەبن.

- ئەم شێرپەنجانەی تووشی درکە پەتك (Spinal cord) وبڕبڕەی پشت دەبن.

- پوکانەوەو لێك هەڵوەشانەوە و فشەڵ بوونی شانەکانی ئێسکی بڕبڕەی پشت جا چی بەهۆی بە ساڵاچوون بێت یاخود نەخۆشی تر.

خوێنەری بەڕێز بە زیاد کردنی زانیاریەکانت دەربارەی هۆکارەکانی پشت ئێشە دەتوانی خۆت بپارێزی لەم ئازارە کوشندەیە.





# پەروەردەکار کێ یە؟

بەمەبەستی خستنەڕوی گرنگیو فراوانی چەمکی پەروەردەو کاریگەریەکانی لەسەر تاک و کۆمەڵگە، ئەرک و بەرپرسیارێتی و خەسڵەتەکانی پەروەردەکار و، ڕۆڵ و کاریگەریی تەکنەلۆژیا لەو بوارەدا، (ژیار) بە پێویستی زانی تەوەرەی ژمارەی یەکەمی خۆی لەژێر ناونیشانی (پەروەردەکار کێیە؟) دیاری بکات و بۆ ئەو مەبەستەش لە دوتوێی چەند پرسیارێک دا ئەم بەرێزانەی دواند:

پرۆفیسۆر دکتۆر عومەر پەتی
دکتۆر ئومێد موفتی
دکتۆر ئازاد عەلی

پرۆفیسۆر دکتۆر عومەر پەتی:



# پەروەردەکار مامۆستایە مامۆستاش دەبێت ڕاستگۆ و سەنگین و پێگەیشتوو بێت

### پێناسەی پەروەردە چیە؟

بە تەنیا یەك پێناسە ناکرێت، بەڵکو هەر فەیلەسوف و بیرمەندو زانایەك و ڕوناك بیرێك بە جۆرێك پێناسەی پەروەردەی کردووە، بۆیە لێرەدا ئێمەش چەندان پێناسەی جیاجیا لە ڕوانگەی ئەم بەڕێزانەوە دەکەین: -

پێناسەی پەروەردە لە ڕوانگەی فەیلەسوفانەوە:

١-ئەرستۆ دەڵێت (پەروەردە سازو ئامادەکردنی هۆش و ژیریی یە بۆ فێربوون)

٢-ئەفلاتون دەڵێت (پەروەردە بریتیە لە بەخشینی هەرچی هەیە لە تەواو بوون و جوانی و بە لەش و جەستە)

٣-سبنسەر دەڵێ (پەروەردە بریتی یە لە سازوئامادەکردنی مرۆڤ بۆ گشت قۆناغەکانی ژیان)

٤- جۆن دیوی دەڵێ (پەروەردە کردارێکی بەردەوامە بۆ سەرلەنوێ بونیاد نانەوەی شارەزایەتیەکان بەمەبەستی بەرفراوان کردن و قووڵکردنی ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتیەکان)

٥-دەتوانین بڵێین (پەروەردە بریتیە لە پێکهێنانی گۆڕانی پێویست لە سیستەمی ژیاندا).

ئەگەر سەیری ئەم پێنج پێناسەی سەرەوە بکەین دەتوانین بەم شێوەیە شیان بکەینەوە:-

ئامادەکردنی تاکە بۆ لایەنی (هۆش و ژیریە) بۆ فێربوون کە ئەمەیان ڕەهەندی یەکەم لە کەسایەتی دەگرێتەوە کە (ڕەهەندی ژیری و زانیاریە).

لایەنێکی تری پەروەردە تەواوی و جوانی لەش و جەستەیە، ئەمەشیان ڕەهەندی جوڵەیی \کارامەیی \پیشەیی \ دەگرێتەوە لە کەسایەتی تاکدا.

لایەنێکی دیکەی پەروەردە بریتیە لە گرینگی و بایەخدان بە لایەنی کۆمەڵایەتیەوە، کە بەشێکە لە کەسایەتی لە تەك لایەنەکانی دەروونی و جەستەیی و هەست و سۆزدا.

### پەیوەندی نێوان پەروەردەو فێرکردن:

بابزانین فێرکردن چیە؟ فێرکردن بریتیە لە کاریگەری لە نێوان مامۆستاو قوتابی، یاخود دەتوانین بڵێین بە هۆی بە کارهێنانی تەکنەلۆژیای فێربوون و لە هۆڵی خوێندن و بە پێ ی ئامانجی دیاریکراو نەخشەو پلانی دارێژراو فێرکردن ڕوو دەدات.

- پەروەردە فراوانترو گشتی ترە لە فێربوون دا، فێربوون بەشێکە لە پەروەردە، واتە دەتوانرێت لە ڕێگەی پەروەردەیەکی دروستەوە فێرکردنیش دێتە ئاراوە، لە هەمان کاتدا دەتوانین بڵێین تەواو کەری یەکترین بۆیە لە دام و دەزگاکانی دەوڵەت بەیەکەوە ناویان دەهێنرێت، (وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن) کەواتە پەیوەندیەکی بەهێز لە نێوان پەروەردەو فێرکردندا هەیە.

### پەروەردەکار کێ یە؟

پەروەردەکار مامۆستایە، هەمووکەس ناتوانێت بەڕۆڵی پەروەردەکار هەڵبستێ، مامۆستاش دەبێ بەشێوەیەکی ئەکادیمی ئامادە بکرێت لە ڕووی زانستی و ئاکاری و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و... لایەنەکانی ترەوە.

### خەسڵەتەکانی پەروەردەکار

خەسڵەتەکانی کەسی پەروەردەکار زۆرە، لێرەدا هەندێکیان دەخەینەڕوو:

یەکەم: مامۆستا (پەروەردەکار) دەبێ تەواو و پێگەیشتو بێت لە هەموو ڕوویەکدا. لەوانە:

شارەزاو پێگەیشتو بێت لە بواری هەڵچوونیدا.

**هەمووکەس ناتوانێت بەڕۆڵی پەروەردەکار هەڵبستێ، مامۆستاش دەبێ بەشێوەیەکی ئەکادیمی ئامادە بکرێت لە ڕووی زانستی و ئاکاری و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و... لایەنەکانی ترەوە.**

لەسەر خۆبێت.

سەنگین و گران و لێهاتووبێت.

توانای دان بەخۆداگرتنی هەبێت.

لەگەڵ خەڵکی ڕێك و پێك بێت و بگونجێت و هەروەها لەگەڵ ئەو گیرو گرفتانەی تووشی دەبێ.

دووەم: پێویستە هەستی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی بەرزی هەبێت:

هەست بە خۆشی بکات و پێی خۆش بێت لە گەڵ خەڵك دابێت.

ڕاستگۆبێت.

بە سۆز و بە زەیی بێت.

قسە وەربگرێت.

بە ویژدان بێت.

ئاگاداری هەست و سۆزی خەڵکانی تربێت.

سێیەم: کردەوەی چاك لە هەڵسوکەوتدا بکات:

ئاکار و ڕەفتاری چاکی هەبێت.

ڕشت و موکر بێت.

نەرمی و خۆشەویستی بنوێنێت.

دیبلۆماسی و زۆرزان بێت لە ڕەفتاریدا.

ئاگاداری ئارەزوو و پێویستیەکانی قوتابی بێت.

چوارەم: توانای دابین کردن و بەکار هێنانی سەر چاوەی تەواوکاری (یارمەتی دەری) هەبێت لە وانەگوتنەوەدا: -

بەکارهێنانی زۆر لە سەرچاوی بۆ فێربوون بە کار بهێنێت.

توانای هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکانی فێربوونی هەبێت.

دەنگێکی خۆش بەکار بهێنێت و یەك تۆن نەبێ واتا (بەرزی و نزمی و مام ناوەندی).

جێ گۆڕکێ بکات، واتا لە کاتی وانە گوتنەوە لە شوێنێکی دیاری کراو نەوەستێ.

ڕواڵەت و جل و بەرگی پاك و خاوێن بێت.

پێنجەم: پێویستیە زانستیەکانی ئاکادیمیای هەبێت.

زانیاری گشتی و فراوان و جۆراو جۆری هەبێت.

لە بواری پسپۆری خۆی دا زۆر سەرکەوتوویێت.

توانای بەکارهێنانی زمانی بەچاکی و کاریگەری هەبێت.

توانای وتوێژکردنی هەبێت.

توانای چاکی لە خوێندنەوەو نووسین و گوێگرتن و بیرکردنەوەی زانستی هەبێت.

شەشەم: بە چاکی پلان بۆ کاری خۆی دابنێت:

بزانێ ئامانجەکانی چین.

پلانی ڕۆژانەی هەبێت.

پاداشت و هاندان بەکار بهێنێت.

ڕێزی قوتابیان بگرێت.

خۆی لەلای قەتابیان خۆشەویست بکات.

لە ئاسانەوە بۆ گران دەست پێ بکات.

ڕەچاوی جیاوازی تاکایەتی بکات.

قسەی ناشیرین و جنێودان بە قوتابیان نەڵێت و ناووناتۆرەو ناز ناوی خەراپیان بۆ دانەنێت.

شێوازی دیموکراسی لە وانە وتنەوە بە کار بهێنێت و دوور بکەوێتەوە لە خۆسەپاندن.

ڕێ نیشاندەری قوتابیان بێت.

سەیری هەر قوتابیەك بکات وەکو تاکێکی سەربەخۆو تایبەتمەندی خۆی تەماشایان بکات.

ناوی قوتابیان لەبەر بکات و هەریەکەیان بەناوی خۆیانەوە بانگیان بکات.

ڕازو نهێنیەکانی قوتابیان بپارێزێت.

هەرگیز پرسیاری قوتابیان بێ وەڵام نەهێڵێتەوە.

بەویست و ئارەزوەوە پیشەی مامۆستایەتی هەڵبژێرێت.

تۆمارێکی تایبەتی هەبێت بۆ تۆمارکردنی نمرە و ئامادەبوونی قوتابیان و بەشداری کردنیان لە وانەکەدا.

سنوورو ئەرکی قوتابیان دیاری بکات.

گرینگی و بایەخ بە پاك و خاوێنی ناو پۆل بدات.

تەنیا تاقیکردنەوە نەکاتە پێوەر بۆ دیاری کردنی چارەنووس و ئایندەی قوتابیان.

ئارام و لەسەر خۆبێ بەتایبەتی لەگەڵ قوتابییانی لاواز و سەرکەش و بزێو.

## هۆکارو ئامرازەکانی پەروەردە

هەندێکیان بەزارو ئاخاوتن دەکرێن وەکو، بەهاکان و ڕەفتاری چاك و نمونەی پێشەنگی لەتاك دا، ئەوانی تریش لە ڕێگەی تەکنەلۆژیای سەردەم تی ڤی

و موبیل و
ئینتەرنێت
ئەمەیشیان
دەوەستێتە سەر شێوەی بە
کارهێنانی و لە ژێر چاودێری
و ئاراستە کردنێکی چاك بێ
ئەگەر نا زیانی زۆرتر دەبێ لە
قازانجی.

### ڕۆڵی تەکنەلۆژیا لە ئاسانکاری یان دروست کردنی ئاستەنگ بۆ پرۆسەی پەروەردە

لە ڕاستی دا تەکنە لۆژیا دووجەمسەرە. لایەنی چاك و خراپی هەیە ئەوەشیان دەوەستێتە سەر شێوازی بەکارهێنانی: ئەگەر شارەزایی و توانایەکی چاك هەبوو لە جۆری بەکار هێنانی ئەوە دەبێتە مایەی ئاسانکاری و گەیاندنی پەیامەکەو یارمەتی دەریش دەبێ و کات و کۆشش دەگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەگەر خوانەخواستە بە نەزانی و بێ شارەزایی و دوور لە کارامەیی بەکار هات ئەو کاتە زیانی دەبێت لە جیاتی سوود گەیاندن.

بەواتایەکی تر: دەبێ ئامانجی بەکارهێنانی ئەم تەکنەلۆژیا یە بزانرێت ئینجا هەوڵی هێنانە دی بدرێت تاکو بە چاکترین شێوە بەکاری بهێنێت: ڕەنگە هەربابەت و وانەیەك تایبەتمەندی خۆی هەبێ لە بەکارهێنانی جۆر و شێوەی ئەم تەکنەلۆژیایە.

**د.ئازاد علی، دکتورا لە زانستە دەرونیەکان و مامۆستا لە زانکۆی کۆیە:**

# پەروەردە پرۆسەیەک نییە بۆ لە ژیان مانەوەی مرۆڤ. بەڵکو بۆ بە مرۆڤ کردنی مرۆڤە



## پێناسەی پەروەردە

پێناسە کردن کارێکی زەحمەتە بە تایبەتیش ئەگەر ئەو چەمکەی دەمانەوێت پێناسەی بکەین چەمکی پەروەردە بێت. زەحمەتی پێناسەکردنی چەمکەکان لەوەدایە کە دەبێت سنوورێکی دیار لە دەوری چەمکەکە بکێشین بە شێوەیەك کە هەر شتێك پەیوەندی بەم چەمکەوە نەبێت بکەوێتە دەرەوەی ئەم سنوورە. ئەوەش کارێکی ئاسان نییە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە دەکرێت هەمان چەمك بە چەند شێوەیەك پێناسە بکرێت، بۆ نمونە لە ڕووی پێکهاتە یان وەزیفە وکردار ویان لە ڕووی زمانەوانیەوە. ئەمەش کارەکە زەحمەت دەکات وهەندێجار زۆری پێناسە بۆ هەمان چەمك سەر لە خوێنەر دەشێوێنێت ولە جیاتی بەرچاوو ڕوونی لەوانەیە بەرچاوی لێڵتر بێت.

ئەو جۆرە پێناسەی کە من پێم باشە بۆ چەمکی پەروەردە بیکەین پێویستە جەخت لەسەر لایەنی کرداری یان وەزیفی ئەم چەمکە بکات. واتە پێناسەکردنی پەروەردە لە ڕێگای دەستنیشان کردنی ئەو فەرمان ووەزیفەی کە پێی هەڵدەستێت، ئەو ڕۆڵەی لە ژیانی تاك وکۆمەڵ دەیبینێت. بۆیە بە ڕای من، پەروەردە بە کورتی بریتیە لە پرۆسەی بە مرۆڤ کردن. بەڵام ئەم پێناسە کورتە پێویستی بە کەمێك ڕوونکردنەوە وڕۆشنایی خستنەسەر هەیە.

مرۆڤ کاتێك لە دایك دەبێت، مرۆڤێکی تەواو نییە. بە واتایەکی تر و بە گوزارشتی فەیلەسوفە کۆنەکان، مرۆڤ کاتێك لە دایك دەبێت مرۆڤێکە (بالقوە) واتە توانای ئەوەی هەیە ببێتە مرۆڤ، وپرۆژەی مرۆڤە. ئینجا منداڵی لەدایك بوو دەبێت پێویستیە فسیۆلۆجیەکانی، وەك برسیەتی و تینویەتی وهتد، لەلایەن کەسانی تر دابین بکرێن. ئەمەش پرۆسەی بەخێو کردنە. بێچووی ئاژەڵانیش هەمان پێویستیان هەیە، ولێرەدا جیاوازیەکی زۆر لە نێوان بێچووی ئاژەڵ ومنداڵ بەدی ناکرێت. بۆیە هەندێ کەس پیشەیان بەخێوکردنی هەنگ یان ماسی یان مەڕومالاتە. پرۆسەی بەخێوکردنی ئاژەڵ ومنداڵ لە زۆرلایەنەوە لە یەك دەچێت کە تێرکردنی پێداویستیە فسیۆلۆجیەکان وزامن کردنی لە ژیان مانەوەیە (survival).

بەڵام پەروەردە پرۆسەیەك نییە بۆ لە ژیان مانەوەی مرۆڤ، بەڵکو بۆ بە مرۆڤ کردنی مرۆڤە. یان بە گوزارشتی فەلسەفی، پەروەردە بریتییە لە پرۆسەی گۆڕین لە مرۆڤ (بالقوە) بۆ مرۆڤ (بالفعل). ئینجا

# به شێوەیەکی گشتی کەسێك ناتوانێت و ناکرێت کاری پەروەردە بکات ئەگەر خۆی بە شێوەیەکی دروست پەروەردە نەکرابێت

لێرەدا پێویست دەکات کەمێك قسە لەسەر مرۆڤ (بالفعل) بکەین چونکە دیارە ئامانج ومەبەستی پەروەردەیە.

بۆ پێناسە کردنی مرۆڤ، بە رای من پێویستە پەنا ببەینە بەر جۆرە پێناسەیەکی ڕێگر یان مانع کە ئەو خاسیەتانەی کە مرۆڤ وئاژەڵ تیایدا بەشدارن وەلا بنێت وتەنها ئاماژە بۆ ئەو خاسیەتانە بکات کە تایبەتن بە مرۆڤ. دیارە خواردن وخەوتن وزاوزێکردن وخۆپاراستن لە ئازار وڕاکردن لە مەترسی خاسیەتگەلێك نین کە تایبەت بن بە مرۆڤ. وابزانم ئەمەش پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە ناکات. بۆیە کاتێك مرۆڤ هەر یەك لەم کارانە دەکات، مرۆڤایەتی خۆی ناسەلمێنێت، بەڵکو مرۆڤایەتی لەوەدایە کە بە ویستی خۆی ئەم کارانە نەکات. بە واتەیەکی تر، مرۆڤایەتی لە تێرکردنی پێداویستیە فسیۆلۆجیەکان نییە، بەڵکو کاتێك کەسێك دەبێتە دیل وئەسیری ئەم پێداویستیانە ئەوا مرۆڤایەتی دەکەوێتە ژێر مەترسی کاڵ بوونەوە ولەناوچوون. دیارە مەبەست ئەوە نییە کە مرۆڤ نکوڵی لە پێداویستیە فسیۆلۆجیەکان بکات وەهەوڵی تێرکردنیان نەدات، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە تێرکردنی ئەم پێداویستیانە ناونیشانی مرۆڤمان پێ نابەخشێت. بەڵکو کۆنترۆڵ کردنی ئەم پێداویستیانە، چ لە لایەن بڕ، چ لە لایەن جۆرەوە، زاڵ بوون بەسەریاندا نەك بە پێچەوانە، ئەوەیە خاسیەتی مرۆڤایەتیمان پێ دەبەخشێت. دەتوانین ئەم خاسیەتە مرۆییە لە چەمکی ویست (ارادە) کورت بکەینەوە.

دووەم خاسیەت کە پەیوەندی بە پێداویستیە فسیۆلۆجیەکانەوە هەیە ئەویش چۆنیەتی تێرکردنیانە وچۆنیەتی سوود وەرگرتن لە پێداویستیەکان وتێرکردنیان بۆ بیناکردنی کۆمەڵگا ودابین کردنی بەختیاری بۆ گشت ئەندامانی ومسۆگەرکردنی پێشکەوتنی مرۆڤەکان لە گشت ڕەهەندەکانەوە. ئەم کارەش بە بێ بوونی توانایەکی باڵا وپێشکەوتوو نایەتەدی. لەبەر ئەوەی ئاژەڵان ئەم جۆرە توانایەیان نییە، شێوازی تێرکردنی پێداویستیەکانیان، لەوەتەی دروست کراون هەزارەها ساڵ پێش ئێستا وتا ئێستا، هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە. ئەم توانایەی مەبەستمان توانای بیرکردنەوە باڵایە.

ئینجا ئەگەر بمانەوێ دەستەواژەی بە مرۆڤ بوون ڕوونتر بکەینەوە دەتوانین بڵێین کە بریتیە لە:

١. بەهێزکردنی ویست و

٢. پێشخستنی بیرکردنەوەی باڵا.

لەدەستدانی هەریەکێك لەم دوو خاسیەتە دەبێتە مایەی کاڵ بوونەوەی مرۆڤایەتی. وهەر هەوڵێکیش بۆ کاڵکردنەوەی هەریەکێك لەم دوو خاسیەتە، کارێکی دژ بە پەروەردەیە، کارێکی دژ بە مرۆڤایەتییە. بە پێچەوانەش هەر هەوڵێك بۆ بەهێزکردنی ویستی وئیرادەی مرۆڤ کرۆکی پرۆسەی پەروەردە پێك دێنێت، بۆیە پێویستە پەروەردە بەو ئاراستەدا بڕوات. لەم پێودانەوە، چاندنی بەها ڕووحی وئەخلاقیەکان لەسەر ئاستی هزر وهەست وهەڵوێست خۆراکی ویستی مرۆڤن وپێویستە پەروەردە زۆر بە جیدی لێیان بکۆڵێتەوە. بە هەمان شێوە، پێشخستنی بیرکردنەوەی باڵا تەنها بە پێدانی زانیاری نابێت، ئەگەر ڕاست وزۆریش بن، بەڵکو پێویستە مرۆڤ فێری بیرکردنەوەی سەربەخۆ وشیکار ورەخنەگر بکرێت بۆ ئەوەی بتوانێت بە خۆی ئەو زانیاریانەی کە هەن هەڵسەنگێنێت وزانیاری تازەش بەرهەم بێنێت. لێرەدا هەر هەوڵێك بۆ پەکخستنی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە، یان ڕێگا گرتن بە بیرکردنەوە بە شێوازێکی جیاواز، کارێکی دژ بە پەروەردەی دروستی مرۆڤی دروستە.

بەڵام بە رای من وەڵامی ئەم پرسیارە تەواو نابێت ئەگەر ئاماژە بۆ مەسەلەیەکی پەیوەست بە پەروەردە نەکەین ئەویش مەسەلەی بە کۆمەڵ بوونە کە بە زمانی عەرەبی پێی دەگوترێت (التنشئە الاجتماعیە یان بە ئینگلیزی socialization). هەندێجار پەروەردە وا پێناسە دەکرێت کە بریتییە لە پرۆسەی بە کۆمەڵ کردنی تاکی مرۆڤ. لێرەدا کاری پەروەردە ئامادە کردنی هاوڵاتییە، واتە وەك ئەندامێك لە کۆمەڵگادا، لە ڕێگای گواستنەوەی گشت داب ونەریت وبیر وشارەزاییە کۆمەڵایەتیەکانە بۆ تاکەکان لە ڕێگای دامودەزگاکانی کۆمەڵگادا.

من کێشەم لەگەڵ پرۆسەی بە کۆمەڵ کردن نییە، بەڵام پێم ڕاست نییە پرۆسەی پەروەردە بە پرۆسەی بەکۆمەڵ کردن یەکسان بکرێت لەبەر دوو هۆی سەرەکی:

یەکەمیان: بە کۆمەڵ بوون خاسیەتێکی تایبەت بە مرۆڤ نییە



بەڵکو زۆربەی ئاژەڵان وزیندەوەران بە کۆمەڵ دەژین وتا رادەیەکی زۆر یان کەم هەندێك ڕێسا هەن کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان ڕێك دەخات وتاکی ئاژەڵ بە شێوەیەك لە شێوەکان دەبێتە تاکێك لە کۆمەڵەکەی.

دووەمیان: مەرج نییە ئەو داب ونەریت وهزرە کۆمەڵایەتیەی لە کۆمەڵگایەك هەیە وهەوڵ دەدات لە ڕێگا دامودەزگا جیاجیاکانیەوە بۆ نەوەی نوێ بیگواستەوە، داب ونەریت وهزرێکی مرۆڤدۆست و مرۆڤدروستکەر بن، بەڵکو لەوانەیە دژ بە مرۆڤ بن ومرۆڤ ڕووخێنەر بن. لەم حاڵەتەدا پرۆسەی بە کۆمەڵ کردن نەك نابێتە پرۆسەی پەروەردە کردن، بەڵکو بە تەواوی پێچەوانەی دەبێتەوە ودژی کار دەکات. کەواتە ئەگەر پرۆسەی بە کۆمەڵ کردن خاسیەتە سەرەکییەکانی مرۆڤی پاراست، ئەوا دەبێتە بەشێك لە پەروەردە، بەڵام ئەگەر ئەم دوور بوو لەم خاسیەتانە یان دژیان بوو، ئەوا بێ گومان ناکرێت بە پەروەردە حسێب بکرێت، بە پێی ئەو پێناسەی کە بۆ پەروەردەمان پێشنیارکرد. هەویری ئەم باسە ئاوێکی زۆر زیاتری دەوێت لەوەی کە باسم کرد، بەڵام ئەوە بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین.

### پەیوەندی نێوان پەروەردە وفێرکردن

ئەگەر پەروەردە بە پرۆسەی بە مرۆڤ کردن پێناسە بکەین، ئەوا فێرکردن دەبێتە ئامرازی ئەم پرۆسەیە. بۆیە پەروەردە وفێرکردن ناکرێت لەیەکتر جودا بکرێنەوە. بەڵام لەبیرمان نەچێت کە فێرکردنیش پرۆسەیە. پرۆسەیەکی مەبەستدارە بۆ هێنانەدی گۆڕانێکی تا ڕادەیەك جێگیرە لە مرۆڤدا چ لە ئاستی هزر وچ لە ئاستی هەست وچ لە ئاستی هەڵوێست بێت. پەیوەندی نێوان پەروەردە وفێرکردن بە دوو پرسیار ڕوونتر دەبێتەوە. پرسیار یەکەم: چۆن مرۆڤ پەروەردە بکەین؟ لێرەدا قسە لەسەر فێرکردن دەکەین وەك ئامرازێك بۆ هێنانەدی مەبەستێك. پرسیاری دووەم: مرۆڤ فێری چی بکەین؟ لێرەدا قسە لەسەر ناوەڕۆکی پەروەردەیە. کەواتە پەروەردە پرۆسە وناوەڕۆکە وفێرکردنیش چۆنیەتی بەڕێوەچوونی ئەم پرۆسەیە وشێوەی ئەم ناوەڕۆکەیە.

### پەروەردە کاری کێیە؟

پەروەردە کاری دایك وباوکە، کاری خوێندنگایە، کاری کۆمەڵگایە بە گشتی. ئەگەر مەبەست لە پەروەردە بە شێوەیەکی نافەرمی بێت، ئەوا دایك وباوك، یان ئەو کەسانەی لە جێگای دایك وباوکن، دەگرێتەوە. بەڵام کاتێك باسی پەروەردەی فەرمی دەکەین، ئەوا دەبێتە ئەرکی ئەو دامودەزگایانەی کە لە کۆمەڵگادا بە فەرمی ئەرکی پەروەردەکردنیان پێ سپێردراوە.

### ئەو مەرجانەی دەبێ لە کەسی پەروەردەکار هەبێ

ئەم بابەتە کەمێك وەستانی دەوێت و بیرکردنەوەیەکی قووڵی گەرەکە.

بە شێوەیەکی گشتی کەسێك ناتوانێت و ناکرێت کاری پەروەردە بکات ئەگەر خۆی بە شێوەیەکی دروست پەروەردە نەکرابێت. عەرەب دەڵێن: فاقد الشيئ لا يعگیه، واتە کەسێك شتێکی نەبێت ناتوانێت شتێك ببەخشێت. ئەگەر کەسێك بەو شێوە پەروەردەییەی کە پێشتر باسم کرد، پەروەردە وئامادە نەکرابێت، چۆن دەتوانێت کەسانی تر بەم شێوەیە پەروەردە بکات؟ بۆ نمونە کەسێك ئەگەر فێری بیرکردنەوەی رەخنەگرانە نەبێت یان هەر بڕوای پێ نەبێت، چۆن

**سەبارەت بە ڕۆڵی تەکنۆلۆجیا لە پەروەردەدا، شتێکی ڕوونە کە تەکنۆلۆجیا ئامرازەو مەسەلەی سوودو زیانی دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی**

دەتوانێت منداڵەکانی یان قوتابییەکانی فێری بیرکردنەوەی رەخنەگرانە بکات؟ باوکێك یان مامۆستایەك کە نەیتوانیبێت بەسەر پێداویستیە جەستەییەکانی خۆی زاڵ بێت، بۆ نمونە ئالوودەی مەی خواردنەوە بووبێت، چۆن دەتوانێت ویستی منداڵەکان وقوتابیانی بەهێز بکات؟

کەواتە پەروەردەکار، چ ئەو کەسەی کە کاری فەرمی پەروەردە کردنە یان دایك وباوك کە پەروەردەی نافەرمی دەکەن، پێویستە مرۆڤ بن بە پێی ئەو پێناسەی کە بۆ مرۆڤمان کرد. واتە دوو مەرجی سەرەکی تیادا بێت:

یەکەم: خاوەن ویستێکی بەهێز بێت کە لە رەفتار وکەسایەتی رەنگ بداتەوە.

دووەم: خاوەن هزرێکی سەربەخۆ ورەخنەگر وپێگەیشتوو بێت کە ئاشنا بێت بە بنەماکان وئامرازەکانی پەروەردە وفێرکردن.

دیارە بێجگە لەو مەرجانە، مەرجی تریش هەن وەك حەز کردن لە پەروەردە

کردن، وهەڵگری پەیامێکی بەرز، خاوەن پەیوەندی کۆمەڵایەتی پتەو وکاریگەر بێت ودەروونساغ بێت.

## هۆکار و ئامرازەکانی پەروەردە

هۆکار و ئامرازەکانی پەروەردە زۆرن. بەڵام گرنگە هۆکارەکە لە شوێنی خۆی ولەگەڵ کەسانی شیاو بەکار بهێنرێت. یەکێك لەو ئامرازانەی کە زۆر فەرامۆش کراون لە بواری پەروەردەی سەردەم بوون بە پێشەنگ (قدوە) یە. ئەو کەسانەی لە بواری پەروەردەن، چ بە شێوەیەکی فەرمی یان نافەرمی، وەك پێشەنگ لەلایەن پەروەردەکراوەکان تەماشا دەکرێن. بۆیە ئەمە مەسەلەیەکی زۆر هەستیارە چونکە ئەگەر پەروەردەکار مەبەستی ئەوە نەبێت کە کەسانی تر لاسای بکەنەوە وچاوی لێ بکەن، بەڵام واقیعی حاڵ وانییە. زۆرێك لە دایك وباوکان، کە ئەرکی پەروەردەکردنیان خراوەتەوە ئەستۆ، بە سەرسوڕمانەوە دەپرسن: منداڵەکەمان لە کێ فێری ئەم کارە خراپانە بووە؟ خۆ ئەگەر ئەم دایك وباوکانە، ئاوێنە ئاسا، بەخۆیاندا بچنەوە وەڵامی ئەم پرسیارەیان دەست دەکەوێت.

چیرۆك یەکێکە لە ئامارازە کاریگەرەکانی پەروەردە لە هەموو قۆناغێکی تەمەندا. چۆن منداڵی بچووك لە گوێ گرتنی چیرۆکێك دۆش دادەمێنێت، گەورەش بە هەمان شێوە. دیارە هەر یەکەیان بە شێوەیەك سوودی لێ وەردەگرێت، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی پەروەردە بە چیرۆك زۆر کاریگەر وسەرکەوتووە.

## ڕۆڵی تەکنۆلۆجیا لە ئاسانکاری یان دروست کردنی گرفت لە بواری پەروەردە

شتێکی ڕوونە کە تەکنۆلۆجیا ئامرازە ومەسەلەی سوود وزیانی دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی. بە شێوەیەکی گشتی تەکنۆلۆجیا کات وماندوو بوونی مرۆڤ کەم دەکاتەوە، بەڵام تەکنۆلۆجیا مەترسی هەیە کاتێك شوێن مرۆڤ دەگرێتەوە. هەر زوو کارل مارکس قسەی لەسەر نامۆبوونی کرێکاران کردووە بەرامبەر بە شوێنگرتنەوەی تەکنۆلۆجیا لە بواری کارکردندا. بە واتەیەکی تر، تەکنۆلۆجیا لەوانەیە مرۆڤەکان لەلایەنی دەروونییەوە لێك دوور بکاتەوە ولەجیاتی سەردانی هاوڕێیەك، تەلەفۆن کردنێك بۆی بەسە. لە جیاتی قسە کردن لەگەڵ میوانەکان، هەموو لا بە پەرۆشەوە سەیری حەلقەیەکی تەلەفزیۆنی دەکەن. لە جیاتی بەهێزکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، گەنج خۆی بە ئینترنیت خەریك دەکات ولە ڕێگای چاتەوە پەیوەندی وەهمی دروست دەکات ورەنگە لە کۆتاییدا ئالوودەی نێت بێت.

بێجگە لەم کاریگەریە لابەلاییە، تەکنۆلۆجیا سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی زانیارییە بۆ هەموو لایەك. ئەم زانیاریانەش بە کاتێکی کورت وبڕێکی زۆر وشێوەیەکی سەرنجراکێش دەست دەکەون. بۆیە پەروەردەکار دەبێت دانایانە مامەڵە لەگەڵ تەکنۆلۆجیا بکات لە بواری پەروەردە وهەرگیز لەبیر نەچێت کە تەکنۆلۆجیا ئامرازە نەك ئامانج.


دکتور ئومێد موفتی
دکتۆرا لە زانستە ئیسلامیەکان زانکۆی سەلاحەدین:




# ڕەچاونەکردنی لایەنی پەروەردەیی لە بەرهەمی تی ڤی یەکان، مرۆڤی جنێوفرۆش و ڕق هەڵگر و ناسەقامگیر بەرهەم دێنێ

## پێناسەی پەروەردە

پێناسەی پەروەردە هەموو ئەوکۆششانە دەگرێتەوە کە کاریگەریێ بۆ داڕشتنی کەسایەتیەکی شیاوو دروست بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەگشتی.

پەروەردەش لە زمانی عەرەبیدا[التربیه] بەواتای نەش و نومماکردن دێت. کەواتە: پەروەردە دەبێت وا لێی تێبگەین کە ئامانجدارەو ئامانجەکانیشی بریتیە لە هەوڵی نەشونماکردنی هێزە دیارو نادیارەکانی تاك بەشێوەیەك کە بتوانێت بە سەلیقەوە ئەو هێزانەی بەکار بهێنێ و وەك ئامرازێکی بەسوود خزمەتی مرۆڤایەتی بەگشتی و دەورو بەری و بە تایبەتی پێ بکات. وە بتوانرێت ئەو تاکە ناوزەد بکرێت بە کارەکتەرێکی چوست و چالاك و چاو



کراوەو داهێنەرو شارەزا، بەم شێوە، کورت تر بڵێین: [پەروەردە] فەلسەفەی ژیانە لە کۆمەڵگەدا.

## پەیوەندی نێوان پەروەردەو فێرکردن

فێربوون و فێرکردن بەواتا فراوانەکەی، ئاستەمە لە پەروەردە جیابکرێتەوە، چونکە پەروەردە کردن لە فێربوونەوە بۆ فێرکردن دەست پێ دەکات، بەڵام دەبێ فێربوون بە فراوانی سەیربکەین. لەووتەی کەسانەوە یان کردەوەیان، یان نووسراویان، یان فێربوون بە بیرکردنەوەو تێڕامان، یان پەند وەرگرتن لە ڕووداوە تاڵ و سوێریەکانی ژیان و...هتد. ئەگەر فێربوونمان بەم فراوانیە تەماشا کرد ئەوە دەتوانین بڵێین: پەروەردە پشت ئەستوورە بە فێربوون.

لێرەدا نموونەیەک بە ئیمامی عەلی (خ) دەهێنینەوە، کە پێش ئەوەی موسوڵمانیش بێت هەرگیز ئاوچاوی نەداوە بە زەویدا بۆ بت وخواکانی قورەیش، ئەم پەروەردەیەشی بە فێربوون وەرگرتووە بە بیرکردنەوەو تێڕامان، هەربۆیە زۆر جار کە ناوی دەبرێ لەپاش ناوهێنانی دەوترێت (کرم الله وجهه) بە واتای: خوای گەورە بە هۆی بیرو هزریەوە ڕێزی لە ناو چاوی ناوەو هەرگیز سەری بەندایەتی نەوی نەکردووە بۆ بت و خودا دروستکراوەکان.

## پەروەردەکار کێ یە؟

لەبەر گرانی ئەرکی پەروەردەو پەروەردەکار، کە دارشتنی کەسایەتی سەرکەوتوو بە تواناو شیاوە و بەهێزکردنی کەسایەتی یەتی، دەبێت پەراوەو شارەزا لە مامەڵەی چینە جیاوازەکان و بیرە جیاوازەکان، دارای لێکدانەوەو ووردبینی و بەهێز لە کەسایەتی و ئامادباشی لە جەستەو ڕەنگ و ڕواڵەت و هەریەک لەم خەسڵەتانە بە کەم کردن و زیاد کردنیان ئەو پەروەردەکارە کەمی و زۆری کاریگەری دیاری دەکرێت.

## ئەو مەرجانەی دەبێ لە کەسی پەروەردەکار هەبێ

کەسایەتی سەرکەوتوو و بەهێز (وەك ئامانجی پەروەردە دەیخوازێت) لەبەر ئەوەی پێویستی بەوە هەیە پەروەردەکراوبێ لە ڕووەکانی (ڕۆح و ناخ، لاشەو هەڵسوکەت، بیرو هزرو عەقڵ) پێویستی بە کۆمەڵێ ڕێگاو هۆکار هەیە بۆ کارتێکردنی ئەو لایەنە جیا جیایانە. هەندێکیشی سادەو سانایە لەسەر دەروون، هەندێکیشی لەوانەیە لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر کاریگەری جیاوازی بێ.

## هۆکار و ئامرازەکانی پەروەردە

ئێمە وەك پسپۆڕێك لە بواری خۆماندا بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین هۆکارە پەروەردەیی یەکان لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا کورت بکەینەوە لە کۆمەڵێك هۆکار، لەوانە:

أ- هۆکاری بەندایەتی و خواپەرستی بەگشتی (فەرزو سونەتەکان)، (العبادات).

ب- پەروەردە بە ووتە (الكلمه) .

ج- پەروەردە بە کردار (العمل) .

د- پەروەردە بە گێڕانەوەی ڕووداوەکان (القصص) .

هـ- پەروەردە بە هاندان و ترساندن (الترغيب و الترهيب) .

و - پەروەردە بە یاری و قسەی خۆش و نەستەق (اللعب والترويح) .

ز- پەروەردە بە فێرکردنی شێوازی گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕی ڕاکان (الحوار والمناقشه) .

ئەمانەو چەندین هۆکاری تر کە لەپێغەمبەری خوداوە (د.خ) بۆ هەریەکێکیان چەندین نموونەی لەسەر هەیە، ئەمە جگە لە قورئانی پیرۆز کە گەر بە ووردی سەیر بکرێت بێگومان لە چەندین جێگەدا پەروەردە بەواتا فراوانەکەی لەوەوە سەر چاوە دەگرێت:

بۆ نموونە قورئانی پیرۆز سەرزەنشتمان دەکات کە شتێك بڵێین بە خەڵك، بەڵام خۆمان هەڵنەستین پێی (لم تقولون ما لا تفعلون) بگرە دەفەرمێ: (كبر مقتا عند الله أن تقولوا ما لا تفعلون)(سورة الصف) کە دیارە کاریگەرترین پەروەردەکار ئەوەیە کە بە کردار سەرنج ڕابکێشێ و ووتە و کرداری هاوتەریبی یەکتر بن.

## ڕۆڵی تەکنۆلۆجیا لە ئاسانکاری یان دروست کردنی گرفت لە بواری پەروەردە

نکۆڵی ناکرێت تەکنۆلۆژیای سەردەم بە بینراوو بیستراویەوە کاریگەری نومایانە لەو بوارەدا بەڵام دەبێت ئەوەش بووترێت کە پێویستی بە پەروەردکار هەیە هەر لە سەرپەرشتیارەوە هەتا بینەرو بیسەرانی، بۆیە زۆرگرنگە بە پۆستیڤ بناسرێت ئەگەر لەو هۆکارانەوە ئامانجەکانی پەروەردە بەدی بهێنرێت. هەریەك لەو ئامێرانە وەك قورێکی صناعی وەهایە کە بە ویستی بەکارهێنەری دەگۆڕێت، بۆ نموونە تەلەفزیۆن و بەرنامەی منداڵان -وەك نموونەیەك- لە کوردستانی خۆماندا، لەهەندێ لایەنەوە پێشکەوتنی باشی بەخۆوە بینیوە، بەڵام بە نەشارەزایی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم ئەداتە کاریگەرەدا وا دەکات کە لەهەندێ فیلم کارتۆنی خراپ دۆبلاژکراو منداڵ فێری قسەووتن و جنێو فرۆشتن بکات، کە ئەمە لەبەر نەشارەزایی و نالێهاتویی سەرپەرشتیاران نەك کەسایەتی ساغلەم دروست ناکا، بەڵکو مرۆڤێکی دەم پیس و پاشتر ڕق هەڵگرو نا سەقامگیرمان بۆ بەرهەم دێنێ، زۆرجار بە ئەستەم منداڵێکی تەمەن بچوك توانای لەبەر کردنی چەند شتێکی پێویستی زۆر کەمە، بەڵام فیلم کارتۆنێك وەك خۆی و بگرە بە جوڵەکانشیەوە نمایش دەکات، کە ئەمە دەریدەخات چەند کاریگەرە ئەو دەروازەیە لەسەر کەسایەتی تاکەکان لەو تەمەنە ناسکەوە.